نوسینی: محمد سعید محمد

# چەند دانا و زانایەکی کوردی موسڵمان

چاپی: یەکەم

1444ک
2023ز



ناوی کتێب: چەند دانا و زانایەکی کوردی موسڵمان

نوسینی: محمد سعيد محمد

دەرچووی کولێژی:یاساو زانستە سیاسییەکان

بەشی زانستە سیاسییەکان ساڵی(٢٠٢٢ــــ٢٠٢٣)

چاپی یەکەم، ساڵی 2023

دیزانی بەرگ: محمد سعيد محمد

# پێشەکی

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورەی جیهانیان،درودو سەلام لەسەرپێغەمبەرمان (موحەممەدﷺ)و یار و هاوەڵانی و هەموو پەیامبەران بەگشتی...

بە پشتیوانی و بەناوی پەروەرێنم دەستم کرد بەنووسینی یەکەمین کتێبم بەناوی (چەند دانا و زانایەکی کوردی موسڵمان) بۆ ناساندنی چەند داهێنەر و زانا و گەڕیدەو تێکۆشەر و کەسایەتیەکی کوردی موسڵمان کە ڕەنگە زۆربەی موسڵمانانی ئێستا ناوی بەشێکی ئەم کەسایەتییانەیان نەبیستێت، وە یاخود نەیانزانی بێت بەهەر هۆکارێک بێت کە ئەم کەسایەتییانە کوردێکی موسڵمانن،یان بێ ئاگان لەژیانیان..

ئێمەی موسڵمان بەگشتی چەندین داهێنەر و زانا و کەسایەتی بەناوبانگی گەورەمان هەیە لەزۆربەی ئەو نەتەوانەی کە موسڵمانن وە لە زۆر کتێبدا باسکراون، وە خزمەتێکی باشی مرۆڤایەتی و شارستانی و ئاینی ئیسلامیان کردووە لەزۆربەی بوارە جیاجیاکانی ژیانەوە، بەڵام ئامانجی من لەم کتێبەدا ئەوەیە تەنها یەجیا باس و ناساندنی کەسایەتیە کوردەکانتان بۆ بکەم بە زمانێکی سادە و ئاسان تاوەکو لەهەموو چین و توێژو تەمەنەکان بتوانن بەئاسانی بیخوێننەوەو لێی تێبگەن و لەخوێندنەوەیدا ماندوو نەبن.

ئێمەی نەتەوەی کوردی موسڵمان چەندین کەسایەتی کوردی موسڵمانمان هەیە کە کەسانی ناوداری ناو ئوممەتی ئیسلامی بونەو

جێ پەنجەیان دیاربووە لە زۆربەی بوارە جیاجیاکاندا کەچ ڕۆڵ و کاریگەریەکیان هەبوە لەشارستانیەتی ئیسلامیدا وەکو موسڵمانێک.

بەڵام مەخابن.. نەتەوەکانی تری موسڵمان ئەو کەسایەتیانەیان بەموڵکی خۆیانیان زانیوەو هەوڵیان داوە ناسنامەی کوردبوونی بەشێکیان بگۆڕن وە کردوشیانن بەناوی خۆیانەوە، هۆکارەکەشی بەهۆی ناشارەزایی و بێ ئاگای خۆمانە لەڕابردوو و مێژووی خۆماندا، بۆیە زۆربەی کەسایەتیە کوردەکان ناناسین و لە ژیاننامە و کارەکانیان بێ ئاگا و غافڵین بەداخەوە.

بەش بەحاڵی خۆم پێم خۆشبوو بەشێک لەو کەسایەتییە کوردانە لەم پەرتووکەمدا باس بکەم و بیخەمە بەر دیدی خوێنەرانمان تاوەکو سوودی لێ ببینن و ئەو کەسایەتیانەش زیاتر بناسن و بزانن کە ئێمەی کورد زمانی موسڵمانیش، هیچمان لە نەتەوەکانی تر کەمتر نییە و خاوەن چەندین کەسایەتی گەورە بووینە کە دەستێکی باڵایان لە پێشکەوتنی شارستانیەتی ئیسلامیدا هەبووە، لە زۆر بواردا.

ئەم کتێبەم لە دوو بەش پێکدێت، بەشی یەکەمی باسی چەند دانا و داهێنەر و کەسایەتیەکی کورد دەکەم، وە لەبەشی دووەمیشیدا باسی چەند زانایەکی ئاینی و مێژوونووس و کەسایەتیەکی تری کوردی موسڵمان دەکەم.

ن: محمد سعيد محمد

کەرکوک_کوردستانی عێراق.

٢٠٢٣/٧/٩ ڕۆژی یەکشەممە.

# دەستپێک

خوێنەری ئازیز.. ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمیشە لەگەڵ زانست و زانیاریدا بووە و هانی موسڵمانان دەدات بۆ زانست و زانیاری.

قورئانی پیرۆز پێکهاتووە لە (٦٢٣٦) ئایەت، لەکۆی ئەو ژمارەیەدا

بەپێی توێژینەوەیەکی دکتۆر (ڕاغب سرجانی)[1] کە دەڵێت: ((توێژینەوەیەکم لەسەر قورئانی پیرۆز کرد دەرکەوت (٧٧٩) ئایەتی باس لە زانست و زانیاری دەکەن، بەشێوازی جیا جیا)).

بەڵام بەداخەوە کە دێینە سەر واقعی موسڵمانان وەکو پێویست لەم ڕۆژگارەدا گرنگیان بە زانست و زانیاری نەداوە، کە ئەمەش بووەتە هۆی بەرەو دوواکەوتن و شکستهێنانی شارستانیەت.

ئەمە لە کاتێکدا کە دەستپێکی شارستانیەتی ئیسلامی بە وشەی (إقرأ_بخوێنە) بووە، لەوکاتەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی پەروەردە کرد بەشێوەیەکی زانستی ڕاست و درووست، پاشان هاوەڵانی و دوای ئەوانیش شوێنکەوتوان(تابعین) و ئینجا سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسیەکان و دوای ئەوانیش ئەوانەی کە دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست، شەش سەدەیەکیش لەم کۆتاییانەوە کە عوسمانیەکان حوکمیان بە قورئان و سوننەت کردووە بە شێوەیەکی گشتی، ئەمانەی کە باسمان کردن توانیویانە ئەم (٧٧٩) ئایەتی قورئانی پیرۆزە کە باسی زانست و زانیاری دەکەن،

---

1_ دکتۆر ڕاغب سرجانی: لەساڵی (١٩٦٤ز)لەوڵاتی میصر لەدایکبووە،کۆلێژی پزیشکی لەزانکۆی قاهیرە تەواو کردووە،گرنگی زۆر دەدات بە مێژووی ئیسلامی و ئێستا لەو بوارەدا خزمەت دەکات. نزیکی٣٠ نوسراوی دەربارەی مێژوو و فیکری ئیسلامی هەیە.

بەباشی جێبەجێی بکەن و هەر ئەوەش هۆکاری سەرەکی بووە لە بەرەوپێشچوونی شارستانیەتی ئیسلامی لە ڕابردوودا.

هەرکاتێک لایەنی خوێندن و خوێندەواری و زانست و زانیاری فەرامۆش کرا چ لەلایەن دەسەڵاتدارانی موسڵمانان یاخود لەلای تاک بەتاکی موسڵمانانەوە بێت، ئەوا شارستانیەتی ئیسلامی بەرو لاوازی هەنگاو دەنێت هەروەکو ئێستا لەبەرچاومانە کە لەم ڕۆژگارەدا بەچاوی سەر دەیبینین بەداخەوە کە جیاوازیەکی زۆرمان هەیە لەگەڵ ڕابردوومان‌دا لەبواری زانست و داهێنان و شارستانیەتدا.

لەکتێبەکانی فەرموودەشدا زۆر باسی زانست و زانیاری کراوە، بەنموونە تەنها لە صحیحی بوخاریدا (٣٠٠) فەرموودە باسی زانست و زانیاری و عیلم دەکەن بەشێوەی جیا جیا.

ئەگەر بمانەوێت باسی هاندانەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکەین لەبواری زانست و زانیاریدا ئەوا ڕەنگە پێویست بە پەرتووکێکی تایبەت بکات تاوەکو لەسەری بدوێین و بیخەینە بەر دیدەتان، بۆیە لەوە زیاتر لەسەر ئەو بابەتە نادوێم و نامەوێت زیاتر لەسەر بابەتی پەرتووکەکەم لابدەم بەڵکو تەنها ویستم وەکو بەرچاو ڕوونییەک سەبارەت بە زانست و زانیاری لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بۆ خوێنەرانی ئازیز بەچەند دێرێک بدوێم و بزانن کە ئاینەکەمان چەندە لەگەڵ زانست و تێکۆشان و زانیاریدایە و دژی نەخوێندەواریە، ئێستاش با بێینە سەر باسی ئەو کەسایەتییانە.

# الجزری (بەدیعو زەمان)

کاتێک کە باسی زاناو داناکانی ئیسلام دەکرێت ناکرێ بیرمان بۆلای (بەدیع الزمان جەزیری) نەچێت. جەزەری یان (جەزیری) یەکێکە لە ئەندازیار و زانا و هونەرمەند و داهێنەرە گەورە و بەناوبانگەکانی ناو ئوممەی ئیسلامی و جیهان و میللەتی کورد بەتایبەتی، مرۆڤایەتی قەرزاری ئەم داهێنەرە گەورەیەیە بە داهێنان و بیرۆکەکانی، لەبواری ئامێرە میکانیکیەکاندا.

ئەم کەسایەتییە بەڕێزە (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت) ڕۆڵ و کاریگەریەکی گرنگی هەبووە لە مێژووی شارستانیەتی ئیسلامدا بە داهێنانەکانی کە بریتیبوون لە چەندین ئامێری گرنگ و پێویست زیاد لە ٥٠ ئامێری جیاواز دەبن کە ڕۆڵ و کاریگەری گرنگی لەبوارە جیا جیاکانی ناو ژیان و شارستانییەتدا هەبووە و کە کۆمەڵێک ئامێر و ئالەتی زۆر بەسوودی داهێناوە، جەزیری بە (باوکی ڕۆبۆت) ناوبانگی دەرکردبوو.

پشت بەخوا باس لە چەند داهێنانێکی بەناوبانگی دەکەین وە لەگەڵ بەشێک لە داهێنانەکانی بەوێنە وەکو نموونە بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەرانی دەخەنە ڕوو.

# الجزری کێیە؟

بەدیعوزەمان ئیسماعیل ئەبولعەز ئیبن رەزاز ئەلجەزیری ناسراوە بە(بەدیع و زەمان) وە بەناوی جەزیرەی (عومەر)ەوە،نازناوی جەزیری وەرگرتووە، کە ئەودەمە سەر بە ویلایەتی شام بووە و ناوەندی جەزیرەی عومەر، دیار بەکر بووە[1]. لە ساڵی ١١٥٣ لە گەڕەکی تۆڕای شاری جەزیرەی بۆتانی ئێستای باکوری کوردستان لە دایک بووە.

بەداخەوە بەهۆی ئەوەی زاناکانی خۆمان ناناسین، لێمان شاردراوەتەوە و عەرب و تورکی چواردەورمان ئەم زانا گەورە و بەڕێزەیان کردووە بەناوی خۆیانەوە، کە لەحەقیقەت و ڕاستیدا کوردی باکوری کوردستانە و خەڵکی دیار بەکری ئازیزە.

باوکی ئەم دانایە ئەندازیار بووە لە کۆشکی (ئارتوکلو)کە شوێنی بنەماڵەی ئارتوکلوی شاری ماردین بووە، کە ئەم بنەماڵەیە حوکمی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵیان کردووە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی (زەنگی) لە موسڵ و دواتریش لەژێر دەسەڵاتی (سەڵاحەدینی ئەیوبی) دا بوون. جزیری لە خوێندنگای (الجامعە)ی، شاری جزیر دەستی بە خوێندن کردووە و تا گەنجێتی هەر لەو شارەدا ماوەتەوە. بە هۆی ژیری و زیرەکییەوە، لەسەر داوای( قەرە ئەرسەلان)ی، حاکمی ئامەدی دەوڵەتی ئەیوبی سەردانی ئامەدی کردووە و بۆ ماوەیەکی درێژ لەوێ ماوەتەوە، لە ساڵی ١٢٣٣ی زاییینیدا کۆچی دوایی کردووە.

زیاد لە ٨٥٠ ساڵ بەر لە ئێستا لە ناو قەڵای شاری ئامەدی باکوری

کوردستان،زۆربەی کار و پیشەکان بە ئامێری هایدرۆ ئۆتۆماتیکی پێشکەوتوو دەکران داهێنەری زۆربەی ئەو ئامێرە پێشکەوتووانەش بەدیعولزەمان ئیسماعیل ئەبولعەز ئیبن ڕەزاز

ئەلجەزیری بووە کە لە سەر فەرمانی قەرە ئەرسەلان حاکمی ئەو کاتەی ویلایەتی ئامەد لەو شارە نیشتەجێ بوو، یەکێک لە داهێنانەکانی دروستکردنی دەرگای گەورەی شاری ئامەد بووە

کە ئەو کاتە شارەکە لە ناو قەڵای ئامەد دا بووە.

جەزیری توانیویەتی ئامێرێکی هایدرۆلیک – ئۆتۆماتیک لە سەر دەرگای قەڵای ئامەد دروست بکات کە دەرگاکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کراوەتەوە و داخراوە.

هەروەها چەند کتێبێکی لەبواری (میکانیکی)دا، نوسیوەتەوە یەکێک لەو کتێبانە ئەویش کتێبی ( كتاب الآلات)ە، کە لە دیار بەکر لەساڵی (١٢٠٦ز) تەواوی کردووە، کە تێیدا باسی چۆنیەتی دروستکردن و کارکردنی زیاتر لە(50) ئامێر کردووە، کە دواتر ناوی ئەو ئامێرانە دەخەینە ڕوو تێیدا باسی چۆنیەتی دروستکردن و کارکردنی بەشێوەیەکی جوان و پوخت دەکات.

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن:ماکوان کەریم، ل:٢٣

جەزەری؛ خاوەنی زیاد لە ٥٠ داهێنانی گەورەیە لەبوارەکانی وەکو:-

- ئەندازیاری
- پیشەسازی
- پلاندانەر
- فیزیازانی
- هەروەها بە بیرکاریزانی سەردەمی خۆی دەناسرێت.

ئەو ئامێرانەی کە دروستی کردوون:

ئەمانە ناوی بەشێک لەو ئامێرانەن کە لەکتێبی (كتاب الآلات)دا، باسی کردووە بریتین لەمانەی خوارەوە:-

- دروستکردنی ڕۆبۆت.

-دروستکردنی چەندین کاتژمێر وەکو:-

(کاتژمێری تیشکی، کاتژمێری ناسراوی جیهانی فیل).

- دەفری وردی جۆراوجۆر،(قاپ و قاچاخ).

- فوارەکان.

- ئامێرە مۆسیقیەکان.

- ئامێرەکانی ئاو بەرزکردنەوە (ترومپا _ مضغة).

- ئامێری ئاش کە بە ئاو کاری کردووە.

- دروستکردنی پاسۆرد بۆ داخستنی قاسە(کۆدی قاسە).

- دروستکردنی مەغسەلی دەست شوشتن.

لەگەڵ چەندین ئامێری جۆراوجۆری دیکە.

---

کتێبی((الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل)) باس لە داهێنانەکانی زانای مسوڵمانی کورد جەزیری ئەکات،ئەتوانن لەڕێی ئەم کتێبەوە تەواوی داهێنانەکانی ببینن.

## کەشتیە موزیکژەنەکەی جزیری:

یەکێک لە بە ناوبانگترین بەرهەم و داهێنانی جزیری کەشتیە موزیکژەنەکەی بووە کە لە بۆنە تایبەتەکاندا لەلایەن دەسەلاتدارەکانەوە بە کارهێنراوە.

لە سەر کەشتیەکە هەشت ڕۆبۆت لە سەر شێوەی ژن دروتکرابوون و هەشت ڕۆبۆتەکە بەسەر دوو بەشدا دابەشکرابوون، چوار ڕۆبۆتی یەکەم گروپێکی موزیکژەن بوون، یەکێکیان دەهۆڵژەن، یەکێک بلوێرژەن، یەکێک تەمبوورژەن و ئەویتریشیان دەفژەن بووە. گرنگی ئەم ڕۆبۆتانە ئەوەیە کە بە هێزی ئاو لە ڕێگای پەمپێکەوە توانیویانە ٥٠ ئاوازی جیاواز بژەنن، بەپێی هەندێک لە لێکۆلینەوەکان دەوترێت ئەگەر جزیری شارەزای موسیقاش نەبوایە نەیدەتوانی ٨٥٠ سال بۆ ٩٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا ئامێرێکی ئاوازەی لەم شێوەیە دروست بکات.

## ڕۆبۆتەکانی جەزیری:

یەکێکی تر لە ڕۆبۆتەکانی ئەوە بووە، ئاوی کردووە بە دەست بەکارهێنەران دا و یەکێکیش خاولی پێبووە و داویەتی بە دەست بەکارهێنەرەکانەوە.

ئەو زانا گەورەیە بە پشتبەستن بە هێزی ئاو، ئامێرێکی بۆ جەژن و ڕێوڕەسمەکان دروست کردووە کە پێشوازیکردووە لە میوانەکانی حاکم و خانەدانەکانی ئەو کاتەی کورد.

## پەمپی ئاو:

جەزیری هەروەها ئامێری پەمپی ئاوی دروستکردووە کە بە هێزی ئاژەڵ کاری کردووە و لە ڕێگای ژمارەیەک بۆری کە ئەوەش هەر لە داهێنانی خۆی بووە، ئاوی لە بیرەکان دەرهێناوە و بۆ خواردنەوە و ئاودێری بەکارهێنراوە. پەمپی بیری ئاوی نەخۆشخانەی شاری حەلەبی سوریاش کە تا ساڵی ١٩٣٦ کاری کردووە، بەپێی بیرۆکەکەی جەزیری دروستکرابوو.

## ئامێری پزیشکی:

هەروەها ئامێرێکی دیکەشی دروست کردووە کە یارمەتی وەستاندنی خوێنی لەشی مرۆڤی داوە کە ئەمەش دەریدەخات، جزیری لە بواری پزیشکیشدا شارەزایی هەبووە.

## کتێبە بەناوبانگەکەی ئیسماعیل جزیری:

لە سەردەمی جزیری دا، بە تەنیا لە کتێبخانەکەی ئامەد سەد و چل هەزار کتێبی جۆراوجۆر هەبووە، جزیری لە ئامەد زۆربەی کاتەکانی بۆ خوێندنەوەی کتێب تەرخانکردووە و بەشێک لە بیرۆکەی داهێنانەکانی لەو کتێبانە وەرگرتووە.

ئیسماعیل جزیری کتێبێکی بە ناوی ( الجامع بين العلم و العمل، النافع في صنايع الحيل) نووسیوە، پرۆفیسۆر دۆناڵد هێڵ لە ساڵی ١٩٧٤ دا کتێبەکەی بە ناوی The Book of Knowledge of Ingenious Mechanical Devices وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، هەروەها محەمەد جەواد ناتق، حەمید رەزا نەفیسی و سەعید رەفعەت جاهـ لە ساڵی ٢٠٠٠دا کتێبەکەیان بە ناوی ( مبانی نظری و عملی مهندسی مکانیک در تمدن اسلامی) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، لە ساڵی ١٩٧٩ دا پرۆفیسۆر ئەحمەد یوسف حەسەن لە شاری حەلەب کتێبەکەی جزیری بۆ سەر عەرەبی نوێ وەرگێڕاوەتەوە.

جەزیری لە کتێبەکەی دا ئامێر و داهێنانەکانی بە شێوەی وێنە کێشاوە و وشەی کوردی بە کارهێناوە کە بە شێوەیەکی زۆر سادە خوێنەر لێی تێدەگات، زۆربەی داهێنانەکانی جزیری لە لایەن (ئەلهارد وەدەمان و فرتز هاوسەر) دوو ئەندازیاری ئەڵمانی دروستکراونەتەوە و (لیئۆنارد داڤینجی) زانای ئیتاڵیش لە زۆربەی داهێنانەکانی دا سوودی لە کتێبەکەی جزیری وەرگرتووە.

پرۆفیسۆر دۆناڵد هیل ئەندازیاری میکانیک و ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی (١٩٢٢ – ١٩٩٢) کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا کتێبەکەی جزیری بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وەرگێڕاوە دەڵێت، هەتا ئێستا لە هیچ شوێنێکی جیهان و لە هیچ شارستانیەتێکدا، بەرهەمێکی زانستی وەکوو کتێبەکەی جزیری نەبینراوە و کتێبەکەی جزیری بە گەورەترین "زانستی پراتیک" ناودەبات.

جزیری لە کتێبەکەیدا بە باشترین شێوە باسی لە چۆنیەتی دروستکردن و کارکردنی ٥٠ داهێنانەکەی خۆی بە شێوەی هایدرۆ ئۆتۆماتیک کردووە، لە ڕێی دروستکردنی "گێربۆکس" هێزی خولانەوەی بۆ چوون و هاتن واتە "جوڵە" ی گۆڕیوە و بەم شێوەیە بناغەی سیستەمی ئۆتۆمبیل و کەشتی دروست کردووە.

ماکۆیی دەشڵێت ١٦ نوسخەی دەستنووسی جزیری لە مۆزەخانەکانی لەندەن، پاریس، دوبلین، بەرلین، لیدن، لینینگراد، ئەستەنبول و ئەمریکا پارێزراون، لێکۆلینەوەیەکی زۆر لە سەر داهێنانەکانی کراوە و سودی زۆری لێ بینراوە، لە بەر ئەوە وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ سەر زمانی کوردی ئەرکێکی زۆر گەوەرەیە و پێویستە لە ناو سیستمی خوێندنی کوردی لە باشوری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستان دا باسی بکرێت.

## ئارامگەکەی جەزیری:

ئەندازیاری کورد، جزیری لەساڵی (١٢٣٣) ز، ماڵئاوایی لە ژیانکردووە و ئارامگا و مەنزڵگەی ئیسماعیل جزیری لە شاری جزیری بۆتان لە باکوری کوردستانە و مۆزەخانەی تایبەتی شاری جزیریش هەر بە ناوی ئەو زانا کوردەوەیە.

لە ناو سیستەمی خوێندنی تورکیادا باس لە جزیری و داهێنانەکانی کراوە بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بە کوردبوونی نەدراوە،لەکاتێکدا جزیری کوردی باکوری کوردستانە و خەڵکی دیاربەکرە.

هەروەها ژمارەیەک فیلم کارتۆنیش بۆ منالان لە تورکیا لە سەر داهێنانەکانی جزیری دروست کراوە.

هەزاران ڕەحمەت لەو ئەندازیار و داهێنەرە کوردەمان بێت، خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات. هەمیشە ناوی بەزیندوویی بمێنێتەوە، ڕاستە خودی خۆی لەژیاندا نەماوە بەڵام ناوبانگ و داهێنان و کتێبەکانی بە میراتی ماونەتەوە.

# چەند وێنەیەک لە داهێنانەکانی جەزیری




وێنەی کاتژمێری فیلی



وێنەی کاتژمێری فیلی

## یەکەم کەس کێبوو کە ئەمریکای دۆزیەوە؟

کاتێک باسی ئەوە دەکرێت کە کێبوو ئەمریکای دۆزیەوە؟ ئەوا یەکسەر بیرمان بۆلای (کریستۆفەر کۆلۆمبوس) دەچێ!

چونکە لە مێژوودا هەروا باسکراوە و بەگوێماندا دراوە،کە یەکەم کەس ئەوەی ئەمریکای دۆزیەوە (کریستۆفەر)ە، بەڵام ئەم گووتەو مێژووە ئەسڵ و ئەساسی نییە..! چونکە یەکەم کەس کە هەردوو جەزیرەی(دورگەی) ئەمریکای دۆزیەوە کوردێکی موسڵمان بوو.

ئێستا ڕەنگە لای زۆربەتان ئەمە شتێکی نوێ و مایەی سەرسوڕمان بێت و بپرسن: چۆن کوردێک ئەمریکای دۆزیوەتەوە؟!!

لەوەڵامدا ئەڵێم: بەڵێ، ئەو کەسەی کە ئەمریکای دۆزیەوە و پاشان نەخشەی هەموو ئەمریکای کێشاو کردیە سەر نەخشەی جیهان، کوردێکی موسڵمان بوو.

ماوەیەک پێش ئەوەی دەست بەنووسینی ئەم پەرتووکەم بکەم

بۆهاوڕێیەکم باسکرد کە بیرۆکەی ئەم کتێبە لەمێشکمدایەو لە پلانمە کە ئەم کتێبە بنووسم چونکە بە پێویستم ئەزانی موسڵمانان و میللەتەکەمان بەتایبەتی ئەم زانیاریانە بزانن کە لەم کتێبەدا باسی ئەکەم.

پاشان باسی ئەوەم بۆی کرد کەوا یەکەم کەس کە ئەمریکای دۆزیەوە و نەخشەی کێشاوە و نەخشەی ئەمریکای خستووەتە سەر نەخشەی جیهان، کوردێکی موسڵمان بووە، هاوڕێکەم زۆر سەری سوڕما و لای سەیر بوو کەوا چۆن کوردێک ئەمریکای دۆزیوەتەوە..!!؟ بەداخەوە هۆکاری ئەو سەرسوڕمانەی ئێمەی

موسڵمان و کورد ئەوەیە کەهەروا فێرکراوین و خراوەتە ڕوو، ئەو کەسەی ئەمریکای دۆزیەوەتەوە (کریستۆڤەر کۆڵۆمبوس)ە، و هەروەها نەوەکانی ئێمەی پێ خەڵەتێنراوە لەوەی کە مێژووی ئەم ئیسلامە و مێژووی ئەم کوردە شێوێنراوە و وەکو خۆی نەماوە تاوەکو بناسرێتەوە و شارەزاییان لێی هەبێت، بەڵام ئەو قسەیە ڕاست نییە کە دەوترێت: کریستۆڤەر ئەمریکای دۆزیەوەتەوە، بەڵکو چوونی (کریستۆڤەر) بۆ ئەمریکا بە ڕێکەوت بووە و تەنانەت گەشتەکەی ئەو بۆ ئاسیا بووە و پاشانیش زۆر زیانی بەخەڵکی ئەو ناوچەیە گەیاندووە کە پێنان دەووتن: هیندیە سوورەکان[1].

ئێستا (ناسا)[2] خۆیان ئەمە بەدرۆ دەخەنەوە و ئەڵێن: کریستۆڤەر کۆڵۆمبوس پیاوێکی شەڕەنگێزی ئینگلیز بووە و سەڵبووتی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە بۆ خەڵک کوشتن،ئایا ئەزانن لەماوەیەکی کەمدا (٨٠) ملیۆن،کەسیان لە 'هیندییە سوورەکانیان"[2] کوشت..؟!!

١ _ ناسا: ئاژانسێکی سەربەخۆی سەر بە حکوومەتی فیدراڵیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە و بەرپرسی بەرنامەی بۆشاییی سیڤیل، توێژینەوەی فڕیننـاسی، و توێژینەوەی بۆشاییی ئەو وڵاتەیە، لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٥٨ دامەزراوە.

٢ _ هیندیە سوورەکان یان نەتەوەی سوو (بە عەرەبی: الشعب سو، بە ئینگلیزی: Sioux indians) نەتەوە و دانیشتووی ڕەسەنی کیشوەری ئەمریکان. زاراوەی هندی سوور لەلایەن دەریاوانی ئیسپانی "کریستۆڤەر کۆڵۆمبس" بەسەریاندا براوە بەڵام لەم سەردەمەدا ناوی ئەم نەتەوەیە بە سوو دەهێنرێت لە بری هیندییە سوورەکان.

## ئەو کوردەی ئەمریکای دۆزیەوە (محیەدین رەئیس)

ئەو کەسەی کە ئەمریکای دۆزیەوە کوردێکی موسڵمانی بەڕێزبوو بەناوی (محیەدین رەئیس) کە ناسراوە بە (پیری) یان (بیری) ساڵی ١٤٦٥- ١٤٧٠ز، لەدایکبووە.

بەڵام بەداخەوە تورک ئەم کەسایەتییەیان کردووەتە بەناو و موڵکی خۆیانەوە، هەرچەندە ئەو کەسە لەسەر ئوممەی ئیسلام حسابە و کەسێکی موسڵمان بووە، بەڵام لەبنەڕەتدا بەڕەگەز کوردە و خەڵکی پیرانی باکوری کوردستانە هەروەکو (شێخ سەعیدی پیران) ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت.

## محی الدين رەئیس کێییە؟

ناوی تەواوی (حاجی أحمد محیالدین پیری) ناسراو بە پیری رئیس (Piri Reis) لەساڵی(١٤٦٥—١٤٧٠)ز، لەدایکبووە، خەڵکی ناوچەی پیرانی باکوری کوردستانە لەنێوان ساڵانی (١٥٥٤ بۆ ١٥٥٥)ز،کۆچی دووای کردووە.

گەورە زانای کورد و ئەدمیراڵ لە گەلە کەشتی عوسمانییەکان نەخشەی تەواوی زەوی کێشاوە زۆر بە وردی.

زانایەکی مسوڵمانی کوردە و شارەزا بووە لە جیۆگرافیا و ئەندازیاری نەخشەکێشی بەتایبەتی زۆر شارەزا و تێگەیشتوو بووە لە نەخشە

دێرینەکاندا هۆکاری ناسرانی بە (پیری ڕەئیس) ئەوەیە وشەی (پیری) بۆ ئەو شوێنە دەگەڕێتەوە کە لێی لەدایک بووە کەواتە ئەم زانایە خەڵکی ناوچەی پیران لە کوردستانی باکوور ئەو شوێنەی کە {شێخ سەعیدی پیران}ی پێ ناسراوە نووسەر (م. ماکوان کەریم) دەڵێ : لە تورکیا تورکەکان بردیانم بۆ سەر گۆڕی ئەم زانایە پێیان وتم ئەمە زانایەکی گەورەی کوردە و ئەدمیراڵ بووە لە سووپای گەلە کەشتی عوسمانییەکان و نەخشەی هەموو زەوی کێشاوە هەروەها وشەی (ڕەئیس) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەرۆک بووە لە سوپای گەلە کەشتی عوسمانییەکان و سەرکردایەتی زۆربەی شەڕەکانی کردووە دژ بە هێرشی پرتوگالییەکان بۆسەر خاکی مسوڵمانان ئەم زانایە لەگەڵ گەلە کەشتی عوسمانییەکاندا زۆر شوێنی جیهان گەڕاوە تا زانیاری لەسەر جوگرافیای زەوی کۆ بکاتەوە لەگەڵ هەموو ئەو نەخشە کۆنانەی هەبوون و دەستی کەوتووە تا بیانکاتە نەخشەیەکی تەواو هەربۆیە سووپای دەریایی عوسمانی ڕێیان پێدابوو سوود لە کتێبخانەی (قوسطەنطەنییە) وەربگرێت وەک سەرچاوەیەک بۆ کارەکەی لە کۆشکی (تۆپکای) لە شاری (ئەستەنبوڵ) لە ساڵی ١٩٢٩ نەخشەکانی ئەم زانایە دۆزرایەوە لەگەڵ کتێبەکەیدا بە ناوی (الكتاب البحرية) کە باسی وردەکاری نەخشەکەی تێدایە وەک وردەکاری سەبارەت بە دەریای ناوەڕاست و دەریای سوور و دەریای ڕەش و زەریای ئەتڵەنتیک و قاڕەکان و کەنداوەکان ڕووبارەکان و کەش و هەوا و بەرز و نزمی ڕووی زەوی و زنجیرە شاخەکان ... هتد ئەم زانایە توانیوییەتی هەموو نەخشەی جیهان زۆر بە وردی لەسەر پێستی ئاسک بکێشێت بەسوود بینین لە توانای خۆی و نەخشە دێرینەکان کە دەستی کەوتوون کە شارەزاییەکی زۆری

پێویستە تێگەیشتن لەو نەخشانە کە هەندێکیان هی (ئەلیکسەندەری گەورە) و زۆر پێش ئەویشە وەک لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێداوە.

مسوڵمانان بە ٥٠٠ ساڵ پێش ئەوەی کریستۆفەر کۆڵۆمبۆسی دز و چەتە ڕێگەی لێ ون بێت و بەڕێکەوت ڕێی بکەوێتە قاڕەی ئەمەریکا کە خۆی لە ئەسڵدا گەشتەکەی کۆڵۆمبۆس بۆ ئاسیا بوو .. مسوڵمانان چوو بوونە هەردوو قاڕەی ئەمەریکا بۆ نموونە زانا (أبو ريحان البارونی) ئۆزبەکستانی باسی بوونی قاڕەی ئەمەریکای کردووە لە نێوان ئاسیا و ئەورووپا کە زەریا لێی دابڕاندووین وە دواتر مسوڵمانان گەیشتوونەتە ئەو قاڕە نوێیە کە ناسراوە بە جیهانی نوێ.

لە ساڵی ١٢٠٤ز لە کاتی هێرشی چوارەمی خاچپەرستەکان زۆرێک لە کتێب و نەخشە مێژووییەکانی کتێبخانەی (قوسطەنطنییە) تاڵانکرا و کەوتە دەست ئەورووپییەکان وە لەبەر ئەمەیە کە دەوترێ کۆڵۆمبۆس زانیاری هەبووە سەبارەت بەو قاڕەی ئەمەریکا پاشان بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکان کۆڵۆمبۆس ناودار کراوە بەحساب زانایە و ئەمەریکای دۆزیوەتەوە لە ساڵی ١٤٩٢ز ئەمەش ڕێی تێناچێت چونکە ئەم کەسە یەکێک لە هەڵە کوشندەکانی پێی وابوو زەوی تەختە چونکە بەپێی دینی مەسیحی زەوی بازنەیی تەختە هەروەها ئەم کەسە بە هەڵە ڕێی کەوتە ئەو قاڕەیە وای زانی ئەو شوێنە وڵاتی هیندستانە لەبەرئەوە ناوی ئەو خەڵکەی بە (هیندی) ناو برد بەڵام لەبەر ئەوەی سوور پێست بوون ناوی بردن بە (هیندیە سوورەکان).

جیاوازی نێوان چوونی مسوڵمانان بۆ قاڕەی ئەمەریکا لەگەڵ چوونی جیهانی مەسیحی ڕۆژئاوا جیاوازی نێوان ئاسمان و ڕێسمانە چونکە مسوڵمانان یەک بستە خاکیان داگیر نەکرد وە یەک کەسیشیان نەکوشت بەڵام کاتێ نەخشەی مسوڵمانان کەوتە دەست ئەورووپای چەتەی خوێن ڕێژ خاکەکەیان داگیر کرد و هەموو خەڵکە ڕەسەنەکەیان کوشت تەنانەت قاڕەی ئوستڕالیاش هەر هەمان چارەنووسی هەبوو بە دەستی بەریتانیای داگیرکەر هەموو خاکەکەی داگیر کرد و خەڵکەکەی ڕەشە کوژ کرد.

## لەباسی نەخشەکەی پیری ڕەیسی:

گەورە زانای کورد (پیری ڕەیس) بە ٢٠ ساڵ پێش ئەوەی کریستۆفەر کۆلۆمبۆس ڕێی بکەوێتە ئەمەریکای باشوور کە لە ڕاستیدا ساڵی ١٥٣٣ ز بوو بە هەڵەواتە لە ساڵی ١٥١٣ ز ئەم زانایە بەشێکی زۆری کارەکانی لە نەخشەی زەوی تەواو کردبوو چونکە یەکێ لە گرنگترین بەشی نەخشەکەی هەردوو قاڕەی ئەمەریکا و بەستەڵەکی باشوورە کە بە وردی لەسەر نەخشەکە دیاری کردبوو لەگەڵ زانیاری زۆر وردی لەسەر نەخشەکە تۆمار کرد بوو پاشان لە ساڵی ١٥٢٨ ز هەموو نەخشەی زەوی تەواو کرد بە کێشانی نەخشەی ئاسیا و ئەورووپا تەواوی زەوی لەسەر تۆپێک

چونکە ئەم زانایە و زانایانی تری مسوڵمان وە قورئان زەوییان بە (الكروية) داناوە وە لەوەش بە دیقەتر شێوەی زەوی قورئان بە (هێلکەی نەعامە) چواندوویەتی کە ئەو شکڵەش لە ٢ ڕۆژی پاش ڕێکخستنی ئاسمان لە ٧ چیندا ئەو شێوەی وەرگرت بەکاریگەری خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا لەکاتی دروستبوونی بوونی هەسارەی زەوی.

لە نەخشەکەی ئەم زانا گەورەیەدا زۆر بە وردی هێڵەکانی درێژی و پانی جیۆگرافی زەوی کێشاوە بەمەش بەنیسبەت قاڕەی ئەفەریقا شوێنی قاڕەی ئەمەریکای زۆر بە وردی لەسەر نەخشەکەی داناوە.

لە نەخشەکەدا ئاوی ئەتڵەنتیکی تێدایە کە پێی وتراوە (زەریای تاریک) کەس نەیتوانیوە ڕێی تێبچێت لەبەر فراوانییەکەی ، لەو گرنگتر و گەورەتر جەمسەری بەستەڵەکی باکووری تیایە هەروەها بەستەڵەکی باشوور لە نەخشەکەیدا داناوە زۆر بە وردی بە ٣٠٠ ساڵ پێش دۆزینەوە،ە ! بەڵام ئەوەی زۆر مایەی زیاتر سەرسوڕمانە لە نەخشەکەدا بەستەڵەکی باشوور هیچ سەهۆڵبەندان نییکە بەڵو وشکانییە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئەم زانایە خۆی نەچۆتە ئەو شوێنە وە لە مێژوویەکی زۆر کۆندا مرۆڤ لەوێ هە بوون وە ئەو شوێنەیان لەسەر نەخشە تۆمار کردووە نزیکەی ٦٠٠٠ بۆ ٤٠٠٠ ساڵ لە پێش لەدایک بوونی پێغەمبەر عیسا هەربۆیە مێشک تەقەبولی ئەوە ناکات کە چۆن ئەم کارە ئەنجامدراوە، مەگەر ئەو نەخشەیە بە تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو وەک بەکارهێنانی فڕۆکە لەو زەمەنە دێرینە کێشرابێت ! دووبارە ئەمەش قورسە مێشک تەقەبولی بکات...!!

# بۆچوونی زانایانی جوگرافیاناس لەسەر نەخشەکەی پیری

زانایانی جوگرافیا و نەخشەی زەوی لەسەدەی بیستەمدا لەسەر کتێب و نەخشەکەی (پیری ڕەئیس) وتیان هەندێ شتی تێدایە هەڵەی تێدا کردووە بەڵام ئەو نەخشانەی زەوی کە دەزگای ئاسمانی ئەمەریکی ناسا بە مانگە دەسکردەکان لە ڕێکی هەرەمەکانی میصر وێنەی گرتن پشت ڕاستی وردی نەخشەکەی ئەم گەورە زانایەی کردەوە ئەوە نەبێت (١ پلە) جیاوازیان هەبوو ئەویش هیچ نییە چونکە بە دەست ئەم خەریتە کێشراوە بەتایبەتی خەریتە کۆنەکان کە وەک سەرچاوە سوودی لێ وەرگرتووە نەقڵی کردووە و لەگەڵ ئەو خەریتانەی خۆیدا لێکی داون و لە یەک نەخشەی کۆیکردوونەوەتەنانەت نەخشەکانی ئەم زانایە هەندێ زانیاری وردی تێدایە کە لەسەردەمی نوێشدا نەزانراو بوو بۆ نموونە لەسەر نەخشەی ئەمریکا ناوی ئەو جێگایانەی نوسیوە کە چ جۆرە ڕووەک و چ جۆرە ئاژەڵ و چ جۆرە گەل و هۆزێکی تێدایە هەروەها چ جۆرە ماسی و خواردنێکی ئاوی لێیە هەروەها جۆری خاکەکەی چییە وە بۆ چ کشتوکاڵێک شیاوە..؟!

ساڵی ١٩٥٣ ئەفسەرێکی دەریایی تورکی خەریتەکانی (پیری ڕیس) نارد بۆ ئەمەریکا بۆ ئەندازیار (M.I. Walters ) لە نووسینگەی هایدرۆگرافی ئەویش داوای یارمەتی لە ( Arlington H. Mallery) کرد تا یارمەتی بدات چونکە شارەزای کار کردنە لەو نەخشە کۆنانەدا هەستان نەخشەکەیان هەموو خستە سەر تۆپێکی وەک زەوی تا لە وردی نەخشەکە دڵنیا ببنەوە سەرەنجام

گەیشتنە ئەو باوەڕەی بە ڕێگەی تەکنەلۆجیا و فڕۆکە لەو
سەردەمە دێرینانە کاری ڕووپێوی (aerial surveying)
ئەنجامداوە هەروەها تەکنیکی زانستی بیرکاری زۆر ورد
بەکارهاتووە وەک ڕێگەی سێگۆشەکاری لەسەر گۆ
(trigonometry spheroid) لەکاتێکدا لە سەدەی ١٨ ئەم
زانستە پەرەی سەندووە بۆیە قورسە باوەڕ کردن! ئەم زانایە زۆر
بە وردی هێڵەکانی جیۆگرافی پانی و درێژی زەوی لەسەر
خەریتەکە داناوە ئەمەش زۆر سەرسووڕهێنەرە و چۆنێتی ئەم
وردەکارییە تا ئێستا سەری لێ دەرناکرێت چۆن ئەمە کراوە ؟!
چونکە لە ساڵی ١٧٦١ ئامێری کێشانی هێڵەکانی پانی و درێژی
زەوی دۆزرایەوە کە ئەویش بە نزیکەییە لەلایەن زانای بەریتانی
(John Harrison) هەر لەبەرئەوەیە کە خەریتەکەی (پیری ڕیس)
هەتا ئەمڕۆ جێی سەرسووڕمانە چونکە زانیاری موستەحیل و
شوێنی نەزانراوی وەهای تێدایە کە تەنها لەو خەریتەدا بوونی
هەیە بۆ نموونە لە کتێبەکەیدا لە ساڵی ١٥٥٩ خەریتەی خاکێکی
تێدایە پانتاییەکەی ١٦٠٠ کم هەردوو ئالاسکا و سیبیریا وەک
پردێک بە یەک دەگەیەنێت بەڵام بەهۆی تواناوەی بەفری قوطبی
باکوور و بەرز بوونەوەی ئاستی ئاوی دەریا ئەو پردی
بەیەکبەستنە دیار نەماوە لە ئێستادا.

سەرچاوەکان:

---

http://www.pacal.de/pirireis_en.htm

http://thebiggestsecretsoftheworld.blogspot.com/2011/02/piri-reis-map-of-1513-out-of-place.html

https://www.youtube.com/watch?v=l4nCZjFjxTI

ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم

https://ckb.m.wikipedia.org/wiki/%D9%BE%DB%8C%D8%B1%DB%8C_%DA%95%D8%A6%DB%8C%D8%B3



نەخشەکەی محیەدین رەئیس

# بۆمبی بێهۆشکەر

یەکێک لەجۆرەکانی (بۆمب) بۆمبی بێهۆشکەرە، بۆمبی بێهۆشکەر هیچ زیانێکی گەورەی نییە و کەس ناکوژێت بەڵکو تەنها بۆئەوەیە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگدا کەمترین کەس بکوژرێت و بەهۆی ئەم بۆمبەوە بۆماوەیەکی کاتی هێزی دوژمن لەهۆش بچن.

ئەو کەسەی ئەم بۆمبەی لە جەنگدا بەکارهێناوە کەسێکە کە لەدوای ئەوەوە بەزەحمەت جیهان فتحکەرێکی ئاوا بەجەرگ و مرۆڤدۆست و بەڕەحمی دەست دەکەوێت و تاوەکو ئێستا لە جیهاندا لەدوای ئەوەوە کەسی ئاوای بەخۆوە نەدیوە، ئەو کەسە تەنانەت ڕێزی زۆری بۆ دوژمنانیشی دائەنا.

ئەو کەسە، کەسێکی ئازا و بەجەرگ و پاڵەوانی چەندین جەنگ بووە و خاوەن تەکنیک و پلانی بەهێزی جەنگی بووە، بە ڕزگارکەری (قودسی پیرۆز) ناسراوە، ئەو پاڵەوانەش باوکی کوردان و جێگەی فەخر و شانازی ئوممەی ئیسلام و میللەتی کوردە بەتایبەتی، تاوەکو ئێستا ناوی بە زیندوویی و بە بەرزی ماوەتەوە، ئەویش باپیرە گەورەی کورد (سەڵاحەدینی ئەیوبی)[1]ە، خوای گەورە پلەی بەرز بکات.

---

١- http://alsiraat.co.uk/books/e-book-salah-ad-deen-al-ayubi-

صڵاحەدین لەهەموو بوارەکاندا بەتوانا بووە لەوانە وەکو:-

سوارچاکی، دروستکردنی مەنجەنیق، ڕاوکردن،

مەلەوانی، دانانی پلانی جەنگی...هتد.

لەهەموو ئەمانەو زیاتریش نموونە بووە لەگەڵ زیرەکی و ژیری و هێمنی و لەسەرخۆی و دینداری، وە لەگەڵ خواپەرستی و خواناسی و دادپەروەریەوە.

هەروەکو لە پێشووتریشدا باسمانکرد کە سوڵتان صەلاحەدین لە جەنگەکاندا بۆمبی بێهۆشکەری بەکارهێناوە تاوەکو کەمترین کەس لەجەنگدا بکوژرێت و کارەساتی گەورە و کوشتاری جەرگبڕ ڕوونەدات، ئەمەش یەکێک بووە لە بەڕەحم و بەسۆزی باوە صەلاحەدینەوە بەرامبەر بە هێزی دوژمانی.

لەکاتی هێرشی خاچپەرستەکان لەچەند ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا (سوڵتان صەلاحەدین) بۆمبی گازی بێهۆشکەری بەکار ئەهێنا کە بۆمبەکە لە (بغوررد – ماددەی ئەفیفۆن و...)دروست ئەکرا کاتێ ئاگری تێبەر بدەی، دوکەڵێکی زۆر ئەکات و خەڵکی بێهۆش ئەکات بۆماوەیەکی کاتی.

---

١ _ وەرگیراوە لە کتێبی (١٠٠١ داهێنان لە کەلەپووری زانایانی موسوڵمان) بەڕێوەبەری نووسین: پرۆفیسۆر سەلیم حەسەنی، وەرگێرانی: جوتیار قارەمان

# کورتەیەک لەژیاننامەی (صلاح الدینی ئەیوبی)

سوڵتان صەڵاحەدینی ئەیوبی کە پێشی وتراوە ابو موزەفەر واتا باوکی موزەفەر، ناوی تەواوی خۆی یوسفی کوڕی نەجمەدینی کوڕی ئەیوبی کوڕی شادییە. کەسێکی کوردی موسڵمانە و دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئەیووبی)یە، لەساڵی (٥٣٢)ی،کۆچی بەرامبەر بە ساڵی (١١٣٧)زاینی، لە قەڵای تکریت لەدایکبووە، کە شارێکی کۆنە و لەنزیک بەغدایە،

لە باکووریەوە قەڵایەک هەیە کە بەسەر دیجلەدا دەڕوانێت کە پاشاکانی فارس لەکۆنەوە لەسەر بەردێکی گەورەوە بنیاتیان نابوو، کردبوویانە جەبەخانەی چەک و شوێنی چاودێری دوژمن، پاشان موسڵمانان لەساڵی ١٦ی، کۆچیدا لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) ئازادیان کرد[1].

کاتێک سەڵاحەدین لەدایک ئەبێ، دایکی بەسەریەوە دەمرێت

وە لەو شەوەدا لەدایک ئەبێت کە بنەماڵەی (شادی ئەیوب)ی، دەربەدەر ئەکرێن و نەجمەددین ئەیوبی باوکی و ئەسەدەددین شێرکۆی مامی سەلاحەددین پێکەوە ئەیانەوێ تکریت بەجێ بهێڵن و بڕۆن بەرەو جێگەیەک کە خۆشیان نازانن بەرەو کوێ

ئەچن.

---

١ _ صڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێرانی:جەمیل قادر ل:٢٤٦-٢٤٧

لە تکریت دەربەدەر کران، شێرکۆی مامی سەڵاحەدین و نەجمەددینی باوکی سەڵاحەدین زۆر بێتاقەت دەبن بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە بەسەریان هاتووەو کەسیش نییە بەدەمیانەوە بچێ، سەرەڕای ئەوەی پێشووتریش خۆیان لەناوچەیەکی ترەوە دەربەدەر کرابوون و پاشان لە تکریت نیشتەجێ ببون، ئێستاش بۆجارێکی تر دەربەدەر ئەکرێن لەناوچەی تکریت کە تێیدا حاکم بوون، بەڵام ئەبێت هەڵبێن و لەو جێگەیەش نەمێنن بیردەکەنەوە لەوەی کە بەشەو بڕۆن بۆئەوەی لەکەمینی خیلافەتی عەباسی ڕزگاریان بێت، ئەوە بوو بەشەو کەوتنەڕێ صەڵاحەدین دەست ئەکات بەگریان و دایکیشی نەماوە تاوەکو شیری خۆی پێ بدات، هەربۆیە باوکی ئەیەوێت بیکوژێت چونکە بە منداڵێکی شومی ئەزانێت لەدوای ئەو هەموو ڕووداوەی کە بەسەریان هاتووە، ئەوانیش دەربەدەری و مردنی دایکی صەڵاحەدینە بەسەریەوە، بۆیە هەرچۆنێک بێت بە شێرۆکی برای ئەڵێت کەوا بیکوژێت و ڕزگاریان بێت لێی، لەوکاتەدا یەکێک لە خزمەتکارەکانی ئەو بنەماڵەیە کە لە " وفايە الأعيان"باسی لێوە ئەکات کە ئەیانەوێ سەڵاحەدین بکوژن چونکە منداڵێکی زۆر شوم و مایەی بێتاقەتی بوو بۆ باوکی، بۆیە بڕیاری کوشتنی ئەدات.

بەڵام یەکێک لەوانەی خزمەتکاریانە لەمێژوودا هاتووە کەوا سەرزەنشتی ئەکات و ئەڵێ: ئەی گەورەم ئەمە چییە..؟! بۆچی وای لێ ئەکەن کە ئەم منداڵە بچووکە وا لەتۆکات ببێتە نارەحەتی و ناهەمواری بەسەر تۆوە کە لەکاتێکدا ئەمە چی تاوانێکی کردووە و چی دەسەڵاتێکی هەیە تاوەکو بەم شێوەیە بیکوژن[1]، بۆچی ئەم بێ دەسەڵاتە ئەکوژن هەموو ئەو ڕووداوانەی کە ڕوویانداوە قەدەری خودای گەورەیە،پاشان تۆ چوزانی کە ئەم منداڵە پاشایەکی گەورە و

شکۆمەندی لێ دەرناچێت، دواتر باوکی وازی لێ ئەهێنێت بەهۆی ئەو قسانەی کە خزمەتکارەکەیان کردی کاریگەری لەسەر دەروونی دروست کردو خێرا چووەوە سەر ڕێبازە دروستەکەی ئیسلام[2]. ئەو پیاوە خۆی منداڵەکە هەڵدەگرێت و دەیبات.

ئەمە بەشێک لە چیرۆکی سەرەتای لەدایک بوونی سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبی بوو، کە دواتر دەبێتە ڕزگارکەری قودسی پیرۆز، ئەو پاڵەوانەی کە لەگەڵ لەدایکبوونی دەربەدەر دەکرێن و دایکی لەدەست ئەدات بەبێ ئەوەی نازی دایکی خۆی ببینێت وبۆنی بکات و چاوی پێی هەڵبێت دایکی ماڵئاوایی لێ دەکات.

ئەمە ئەو سوڵتانەیە کە باوکی بە منداڵێکی شومی ئەبینی و نەزان بەوەی کە هەر ئەم منداڵە لە داهاتوودا ئەبێتە ڕزگارکەری قودس و خەونی چەند ساڵەی موسڵمانان بەدی دەهێنێت بە ڕزگارکردنی یەکەم ڕووگەی موسڵمانان لەژێر دەست و دەسەلاتی خاچ پەرستان.

یەکێک لە ووتە بەناوبانگەکانی صلاحەدینی ئەیووبی:

"من چۆن دڵخۆش بم وچێژ لەخواردن ببینم لەکاتێکدا قودس بەدەستی سەلیبیەکانەوەیە! "

١-ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم، ل:٤٧٣- ٤٧٤

٢-صلاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێرانی:جەمیل قادر ل:٢٤٧

# نەسەب و ڕەچەڵەکی ڕەسەنی سوڵتان صەلاحەدین

سەلاحەدینی ئەیوبی لەخێزانێکی کوردی ڕەسەن لەدایک بووە کە خاوەن شەرەف و نەسەبی کوردین و خەڵکی شوێنێکن کە ئەگەڕێتەوە بۆ عەشایەری "ڕەوادی" رەوادیش تیرەیەکن لەخێزانی هەزبانی،کە یەکێکە لە دەوڵەتە کوردیەکان لە (ورمێ)وە، دەسەلاتیان دەستی پێکردووە تا ناوچەکانی خوارو و عێراق و ناوەندی ئێران، هەروەها (حەسنەوی،دیناوەری و ئەیوبی) کە هەموو ئەمانە دەوڵەتی کوردی بوون و دەستی خێریان هەبووە بەسەر جیهانی ئیسلامیەوە.

ئەم بنەماڵەیە بەڕەسەن لە هەزبانیەکانن و هۆزو عەشیرەتێکی کوردن لەنێوان (ئەرمینیا و ئازربایجان)و ئەو ناوچانە ئەژین کە نزیکن لە ورمێ، واتا رەزاییەی ئێستا، گوندەکەیان ناوی "ئەجدنیقان"بووە نزیک شاری (دیون)ی، ئازەربایجان.[1]

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم، ل: ٤٧٢

## هۆکاری کۆچکردنەکەی بنەماڵە و باوانی صلاحەدین

ئەم خێزانە بەهۆکاری کێشەی خۆیان لەگەڵ (ئەرمەنەکان)دا،کە خێزانێکی زۆر گەورەن ئەبێت بەشەڕیان، زۆر لەیەکتری ئەکوژن لەدوای ئەوەی کە سوڵتە و دەسەڵاتیان کەم بووەوە توانای ئەرمەنەکانیان نییە، چونکە دەوڵەتی "قرژ" دەوڵەتێکی نوێی بەهێزە و سەرەتایەتی و دەست پێ ئەکات و سەردەهێنێت لەگەڵ دەوڵەتی جۆرجیا هەردووکیان دەوڵەتێکی نەسارای زۆر خراپەکارن، هاوکاری کۆمەڵێک خەڵک ئەکەن لە ناوچەکانی (خەواریزم)دا، کە ئەمانیش توانایان نییە ڕوبەڕووی خەواریزمەکان و دەوڵەتی قرژ و دەوڵەتی جۆرجیا ببنەوە، بۆیە ناچارن بەکۆچەری دێن و ناسراویەکیان هەیە لەگەڵ "بەهرۆزدا" دا، سەرۆکی شورطەی بەغداد بووە لەو سەردەمەدا، کە زۆر خۆشەویستە لە دڵی خەلیفەی موسڵمانان نجم الدين ئەیوبی باوکی سەلاحەدین، باوکی سەلاحەدین زۆر هاوڕێیەتی لەگەڵ (بەهرۆزدا) هەیە و لەو ناوچەیە نیشتەجێ ئەبن.

ئەم بنەماڵەیە دێنە ناوچەکانی شاری "تکریتی" کە شارێکی زۆر کۆنە، لەسەردەمی دەوڵەتی فارس قەڵاو قولەیەکی زۆر زۆری تێدا بووە، جێگەیەکە لەسەر ڕووباری دیجلەیە، ئەم قەڵایە پێشتر سەرچاوەی ئازوقە و زەخیرەو مەخزەنی فارسەکان بووە لەدژی ڕۆمەکان، ناوچەیەکی زۆر بەربڵاو و گەورەیە، کاتێک (ئەیوب شادی) واتە باپیری صلاحەدین ئەیوبی کە ناوی شادی بووە و باوکی صلاحەدینیش واتا نجم الدين ئەیوبی کە دێن پەیوەندی ئەکەن بەو

(بەهرۆز)ەوە، کە پەیوەندی پێوە ئەکەن ئەوانیش لەبەرئەوەی کە خێزانێکی گەورە و ماقوڵن، بەهرۆز باوکی صلاحەدین ئەکات بە ئەمیری ئەو جێگەیە، هەروەها (ئەسەد الدین شێرکۆ) کە مامی سەلاحەددین بووە، ئەیکاتە هاوکاری براکەی کە بووە بە حاکمی ناوچەی تکریت.

بۆیە ئەم خێزانە ئەوەندە خۆشەویست بوونە لەناو خەڵکدا، چونکە ڕەچەڵەکیان ئەگەڕێتەوە بۆ هەزبانییەکان[1].

مێژووی هەموو ئەم ڕووداوانەی کە باسمان کرد ئەگەڕێتەوە بۆ پێش لەدایکبوونی سوڵتان صەڵاحەدینی ئەیوبی.

١ _ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ٤٧٢_٤٧٣

## هۆکاری دەرکردن و هەڵهاتنی بنەماڵەی(ئەیوب شادی) باوانی سڵاحەدینی ئەیوبی لە تکریت چی بوو؟

نجم الدينى باوكى سەلاحەدين هەستا بە خزمەتكردنی سوڵتانی سەلجوقی (محەمەدی کوڕی مەلکشاه) ئەویش دەستپاکی و ژیری و جوامێری تیادا بەدیکردبوو قەڵای تکریتی پێ سپارد وە (نەجم الدين) بەباشترین شێوە بەڕێوەی برد و بەتەواوی کۆنترۆڵی کرد،هەروەها خەڵکی خراپەکار و چەتەی تیادا نەهێشت وە ئەمەش بووە هۆی ئاوەدان بوونەوە و باشبوونی باری گوزەران تیایدا[1].

هەروەها ئەبو "شامە" باسی ئەوە دەکات کە ئەسەدەدین شێرکۆ لەپێشەوەی ئەمیرەکاندا بووە لای سەلجوقیەکان و ناوچەیەکی بەرفراوانیان بۆ تەرخانکردبوو لە تکریت و دەوروبەریدا کە نرخەکەی ساڵانە بە نۆسەد دینار مەزەندە دەکرا[2]. ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر بوو بۆ ئەوکاتە[3].کات تێپەڕی ڕۆژی لەدایکبوونی سەلاحەدین هات. سەیر و سەمەرەکانی قەدەریش ئەوەبوو کە ڕۆژی لەدایکبوونی سوڵتان صەلاحەدین هاوکات بوو لەگەڵ ئەو ڕۆژەدا کە "مجاهد الدين بەهرۆز" والی بەغداد فەرمانی کرد[4] بە هەردوو کەسایەتی نەجم الدين ئەیوب و شێرکۆی برای کە قەڵای تکریت

---

١ _ كتاب الروضتين (٢٥٢/٢)

٢ _ كتاب الروضتين (٢٥٧/٢)

٣ _ تاريخ بيت المقدس، د.محمد الحافظ التقرل، ل:١٣٣

٤ _ صڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێڕانی:جەمیل قادر،ل:٢٤٧

جێبهێڵن بەهۆی کوژرانی یەکێک لە سەرکردەکانی قەڵا لەلایەن شێرکۆی مامی سەڵاحەدینەوە بەهۆی ئافرەتێکەوە کە ئەو سەرکردەیە ویستبووی ئابڕووی لەکەدار بکات، شێرکۆش تۆڵەی بۆ شەرەف و پیاوەتی کردەوە و کاتێ کە ئافرەتەکە هانای بۆی هێنا، بەهرۆزیش دوو دڵ بوو نەیدەزانی ئایا لای خۆی بیانهێڵێتەوە یاخود فەرمانیان پێ بکات بۆ جێهێشتنی قەڵاکە..؟! چونکە ئەگەر بیهێشتنایەتەوە لەتۆی سەرکردەکان دەترسا کە تووشی شتێکیان بکەن، بۆیە هیچ چارێکی تری نەبوو جگە لەوەی فەرمانیان پێبکات کە ناوچەکە جێبهێڵن، ئەوەبوو هاتە لایان و خەمی خۆی بۆ دەربڕین و داوای لێکردن کە شەو ناوچەکە بەجێبهێڵن، ئەوانیش ئەوێیان بە خێزانەکانیانەوە بەجێهێشت بەرەو موسڵ بەڕێکەوتن، سەڵاحەدینش تازە لەدایک ببو و دایکیشی بەسەریەوە گیانی سپارد دبوو، سەڵاحەدینش بێنازی دایکی بوو لەباوەشی باوکیدا دەگریا، باوکیشی زۆر نارەحەت بوو هەروەها سڵاحەدینی بە منداڵێکی شووم ئەبینی بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ لەدایکبوونی ئەودا ئەوشتانەیان بەسەرهاتووە،هەروەکو لەپێشووتردا باسی ئەم ڕوداوەمان کرد کە دواتر خزمەتکارەکەیان دەرونی نجم الدين ئارا، هاتووە باس لەوە دەکات کە ئەڵێت: بەهرۆز زۆر خەجاڵەت بوو بەوەی کە بەرامبەر بەم خێزانە کوردیە بوەستێتەوەو پێی ناخۆش بوو بۆیە ڕێگەی بۆکردنەوە و پێش ئەوەی هێرش بێنە سەریان پێی ووتن: بڕۆن لەناوچەکەدا، چونکە خەلیفەی عەبباسی ئەیەوێت لەناوتان ببات[1].

هەردوو برا لە تکریتەوە کۆچیان کرد بۆ موسڵ و چوونە لای

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم،ل:٤٧٣

عیمادەدینبەخششانەی وەکو پاداشتێک وابوو بۆ هەڵوێستی دڵسۆزانەیان کاتێ هەستان بە ڕزگارکردنی عیمادەدین لەکوشتن یان لە بەدیل گیرانی، ئەمەش کاتێک بوو کە عیمادەدین فەرمانڕەوای موسڵ، لەنزیک تکریت لەسەردەمی والی بەغداد، ڕووبەڕووی سەلجوقیەکان بوویەوە و سوپاکەی لەبەرامبەر سوڵتانی سەلجوقیەکان تێکشا و لەکاتی پاشەکشە و گەڕانەوەی بۆ موسڵ بە تکریتدا تێپەڕی و گیانی خۆی و سوپاکەی کەوتە ژێر دەستی (نجم الدين) کە والی تکریت بوو[2].

نجم الدینی ئەیوبی کە باوکی سەڵاحەدینە، ئەیتوانی بیانکوژێت یان ڕزگاریان بکات، (نەجم الدين)یش، چاکەی هەڵبژارد و لەگەڵ شێرکۆی برایدا هەستان یارمەتیدانی عیماد الدين و ڕێگەی ڕزگاربوونیان بۆی ئاسانکرد هەتاوەکو بەسەلامەتی گەیشتەوە موسڵ،نجم الدینی ئەیوبی کە باوکی سەڵاحەدینە، ئەیتوانی بیانکوژێت یان ڕزگاریان بکات، (نەجم الدين)یش، چاکەی هەڵبژارد و لەگەڵ شێرکۆی برایدا هەستان یارمەتیدانی عیماد الدين و ڕێگەی ڕزگاربوونیان بۆی ئاسانکرد هەتاوەکو بەسەلامەتی گەیشتەوە موسڵ.

---

٢ _ صەڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێرانی:جەمیل قادر،ل:_٢٤٧-٢٤٨

# پەروەردەکردنی صلاحەدینی ئەیوبی

دوای ئەوەی باوک و مام و بنەماڵەکەی صەلاحەدین و صلاحەدینی تازە لەدایکبوو گەیشتنە موسڵ بۆلای عیماد الدین زەنکی، عیماد الدین زەنکیش ڕێزێکی زۆری لێیان گرت و باوەشی بۆ کردنەوە و پارەو موڵک و بەخششێکی زۆر و باشی پێیان بەخشی وەکو وەفاو چاکەیەک بەرامبەر بەوەی کاتی خۆی بنەماڵەی ئەیوبی لە تکریت ئەویان ڕزگار کردووە، عیماد الدین پێیانی ووت: ئەم جێگەیەی کە بۆی هاتوون ماڵ و مەنزڵگەی خۆتانە.

عیماد الدین پیاوێکی زۆر بەڕێز بووە و خاوەن موسڵ بوو، لەو سەردەمەدا بەشێک لە سەلاجیقەکان کە تورکمانن دژایەتی ئەم پیاوەیان ئەکرد، چونکە ئەم پیاوەش خۆی هەر تورکمان بوو، بەڵام لە سەلاجیقەکان نەبوو بەڵکو لەبنەماڵەی زەنکی بوو،بەڵام والی یەک بوو لەلایەن سەلجوقیەکانەوە دامەزرابوو، کە ئەوکات سوڵتەو دەسەلات لەلایەن دەسەڵاتدارەکانەوە دابەش ئەکرا نەک لەلایەن خەلیفەکانەوە[1].

عیماد الدین کەسێکی دیندار و موجاهید بوو بەردەوام لە جیهاد و تێکۆشان بوو، وەفای نجم الدین و ئەسەد الدین شێرکۆی لەبیر نەئەچوویەوەو ویستی قەرەبووی هەندێک لەو چاکانەی بۆ بکاتەوە،عیمادەدین کەسێکی ژیر بوو دەیویست جێ پێی خۆی قایم بکات و هەموو میرنشینەکان یەکبخات و خۆی ئامادە بکات بۆ جەنگی نەساراکان و جیهاد بۆ ئەمەش پێویستی بەو دوو قارەمانە

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم،ل: ٤٧٤

بوو، ئەوانیش نجم الدین و شێركۆن، هەروەها دوای ئەوەی جیهاد

و خەبات دەستی پێكردەوە دژی نەساراكان و باطنیەكان،عیماد الدین بە سوپاكەی خۆیەوە توانیان جێگەیەک ڕزگار بكەن كەناوی (بەعلەبەك) بوو لەساڵی (٥٣٤)ی، كۆچی ئازادی كردوو خستیە ژێر حوكمی خۆیەوە،هەروەها نەجم الدین ئەیوبی باوكی سەڵاحەدینی كردە والی ئەو جێگەیە، لەپاشان زیاتر گرنگیدان بە صلاحەدینی ئەیوبی، چونكە ڕاستە چەند ژنێكی هەبوو بەڵام لەو سەردەمەدا عیماد الدین و ئەو خەڵكانەی تر بەردەوام پێیان خۆشبوو منداڵێک خۆیان پەروەردەی بكەن بەو شێوەیەی كە ئەیانەوێت، بۆیە سڵاحەدین نەچووە لای باوكی پەروەردە بێت، ڕاستە ماوەیەک لە (بەعلەبەک)بوو، بەڵام تەمەنی منداڵی لەلای عیماد الدین پەروەردە بووە نەک لای باوكی، باشترین كەسایەتی و گەورەترین سەركردەش دەرچووە.سەڵاحەدین لەباوكیەوە وەری نەگرتووە هەرچەندە باوكی كەسێكی بەتوانا و دیندار و والی بووە، بەڵام ناكاتە كەسایەتی عیماد الدین زەنكی، بۆیە عیمادەدین خۆی سڵاحەدینی پەروەردە كردووە، زۆریش ڕێزی لە كەس و كاری گرتووە وە ڕەوشتێكی جوان و سەركردای و دینداری وای فێر ئەكات كە سڵاحەدین لەتەمەنی ٦-٧ ساڵیدا هەموو قورئان لەبەر دەكات.سڵاحەدین ئەوەندە بەتوانا پەروەردە ئەبێت لەسەر دەستی كوڕەكەی عیماد الدین زەنكیدا بەناوی (نورالدین محموود) پۆستی گەورەی شورطەی هەموو دیمەشق ئەگرێتە ئەستۆی خۆی، هیچ كەسێک ناتوانێ لەسەردەمی سەڵاحەدیندا كە هەندێک ئەڵێن تەمەنی ١٨ــ١٩ ساڵە و هەندێكی تریش ئەڵێن تەمەنی لەنێوان ٢٠ــ٢٢ساڵی دا بووە كە توانی پۆستی شورطە بگرێتە دەست كەئێستا پێی دەوترێ پۆلیس، لەسەردەمی

بەڕێوبەرایەتیەکەی ئەودا دیمەشق دزی تێدا نەمابوو، سڵاحەدین کەسێکی دیندار و بەتوانا بوو لەناو دیمەشقدا، کە خۆی ناوی یوسف بووە ناوی یوسف صڵاحەدینی لێتراوە، ئەوەندە خۆشەویست بووە لەناو خەڵکیدا هۆنراوەیان بەسەردا ئەوتەوە، خۆی بەشەوان دا ئەگەڕا بەسەر گەڕەکەکاندا، دەڵێن:وەک عومەری کوڕی خەتاب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە کە لەو تەمەنە منداڵیەدا ئا بەو شێوەیە پەروەردە بوو بوو، لەو سەردەمەیا هەستی بەرپرسیاریەتی و دینداری و ئەمانەتێک کردووە کە لەسەر شانی بووە بیەوێ بەجوانترین شێوە ئەو خەڵکەی کە لەبەر دەستیدایە ئەمن و ئاسایشیان بۆ دیاری بکات[1].

---

١_ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان،ل: ٤٧٤_٤٧٥

## لەپێش ڕزگارکردنی قودسەوە

لەپێش ڕزگارکردنی قودسەوە و لەسەردەمی گەنجیدا سڵاحەدینی ئەیوبی چەندین کار و چاکسازی گرنگی ئەنجام داوە بەڵام ئێمە لە باسکردنی ئەو ڕووداوو و مێژووانەی کە ڕوویانداوە لە ژیانی سوڵتان صەڵاحەدیندا تێپەڕین و هاتینە سەر باسکردنی ڕزگارکردنی قودسی پیرۆز،لەبەر ئەوەی ئەگەر باسی هەموو ڕوداوەکانی نێو ژیانی بکەین ئەوا کتێبێکی قەبارە گەورە و تایبەتی ئەوێ تاوەکو تێیدا باسی هەموو ئەو ڕوداووە مێژوویانەی ناو ژیانی بکەین، مەبەستی منیش تەنها بەکورتی باسکردنی ژیاننامەیەتی لەگەڵ چەند ڕووداوێکی کەمی نێو ژیانی تا ڕۆژی وەفاتکردنی.

ئێستاش با بێینە سەر باسی چۆنیەتی پێش ڕزگارکردنی قودس و کاتی ڕزگار کردنی قودس لەلایەن سڵاحەدینی ئەیوبیەوە.

## جەنگی حطين

جەنگی حەتین، شەڕی حەتین یان فەتحکردنی قودس یاخود ڕزگارکردنی قودس (بە عەرەبی: معركة حطين يان فتح القدس، بە ئینگلیزی: Battle of Hattin) ئەو جەنگە بوو کە قودس لەژێر دەستی دەسەڵاتی خاچپەرستانی شام لەلایەن سوپای موسڵمانان بە ڕابەرایەتی سەڵاحەدینی ئەیووبییەوە ڕزگار کرا، لە ٢٥ـی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٥٨٣ـی کۆچی بەرانبەر بە ٤ـی تەمووزی ساڵی ١١٨٧ زایینی ئەم جەنگە لە سنووری وڵاتی فەلەستین لە ناوچەی حەتین ڕوویدا و بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتاییهات و دوای ٨٨ ساڵ لە داگیرکاری خاچپەرستان لە قودس کۆتایی بە دەسەڵاتیان هێنرا.

## هۆکاری ناونانی بەو ناوەوە:

جەنگی حەتین لە سنووری ناوچەکانی وڵاتی فەڵەستین ڕوویدا و بە دیاریکراوی لە گوندێکی دەشتایی بە ناوی حەتین جەنگەکە هەڵگیرسا، کە ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان ناوچەی ناسڕە و تبەریا کە بە دووری نۆ کیلۆمەتر لە ناوچەی تبەریا دوورە. گوندی حەتین بە ناوچەیەکی ستراتیجی دانرابوو چونکە دەکەوتە سەر ڕێگای سەرەکی بازرگانی نێوان شام و عێراق و میسر، بۆیە سوپای موسڵمانان لە گوندی حەتین ڕووبەڕووی سوپای خاچپەرستان بوونەوە و جەنگەکەش بە ناوی جەنگی حەتین ناسرا.

## هۆکاری هەڵگیرسانی جەنگەکە:

زۆرێک لە ناوچە و وڵاتانی موسڵمانان و بە دیاریکراوی قودس لەلایەن خاچپەرستان لە ساڵی ١٠٩٩ـەوە داگیرکرابوون و بۆ ماوەی نزیکەی سەدەیەک ناوچەکان لەژێر دەسەڵاتی پاشا و فەرمانڕەوای خاچپەرستەکان بوو، ئەمە هۆکارێکی ناڕاستەوخۆ بوو بۆ ڕزگاربوون و ئازادکرنی ناوچەکان و دروستبوونی جەنگی حەتین.

بەڵام هۆکاری سەرەکی هەڵگیرسانی جەنگی حەتین بریتی بوو لە هێرشێکی (ڕینێ دی شاتلۆن) ناسراو بە ئەڕنات بۆ سەر چەند قافڵەیەکی بازرگانی موسڵمانەکان و زیانی پێگەیاندن و قافڵە و بارە بازرگانییەکەی تاڵان کرد، لە کاتێکدا لە ساڵی ١١٨٠ ئەو پەیمانی ئاشتی بەستبوو و بەڵام پەیمانەکەی پێشێڵ کرد و قافڵەیەکی بازرگانی کە لە قاهیرەوە دەرچووبوو بۆ دیمەشق تاڵان کرد و بازرگانەکانیشی

بەدیل گرت، بەپێی چەند سەرچاوەیەک دەرکەوتووە کە خاوەنی ئەو قافڵە بازرگانییە خوشکی سەڵاحەدینی ئەیووبی بووە، بۆیە سەڵاحەدین ڕاستەوخۆ داوای لە پاشای قودس لەو سەردەمە پاشا گای دی لۆزینیانی کرد کە قەرەبووی زیانلێکەوتووان بکاتەوە و دیلەکان ئازاد بکات، بەڵام پاشا داواکەی سەڵاحەدینی ڕەتکردەوە و هەروەها قسەی ناشرینیشی بە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ وتبووە، ئەمەش سلاحەدینی زۆر تورە کردبوو، بۆیە سەڵاحەدینی ئەیووبی لە هەمان ساڵ بڕیاری جەنگی بۆ سەر شانشینی قودس دا، بەڵام بەهۆی نەخۆشکەوتنی سەڵاحەدین ساڵێک جەنگەکە دواخرا.

## ڕووداوەکانی پێش جەنگ و ئامادەکارییەکان :

پێش جەنگی حەتین سەڵاحەدین و ئەیووبییەکان چەند ناوچەیەکی ستراتیجی و گرنگی شام و میسرییان لەژێر دەسەڵاتی خاچپەرستان نموونەی چەند مینا و بەندەرێکی ئاوی و چەند قەڵایەکی گرنگی ستراتیجی ڕزگار کردبوو. لە بەهاری ساڵی ١١٨٧ هەردوو قەڵای کەرەک و مۆنریاڵیان لە ئوردن داگیرکرد، دوای دوو مانگ لە میسر بانگەوازی کرا بۆ ناو تۆمارکردن و خۆبەخشکردن بۆ جەنگ دژی خاچپەرستان، هەر بە هەمان مەبەست نامەی ئاگاداری نێردرا بۆ ناوچەکانی مووسڵ و نیمچەدوورگەی عەرەبی و شام و داوای هاوکاری و خۆبەخشی کرا بۆ جەنگ دژی خاچپەرستان، هاوکات لە هەردوو شاری قاهیرە و دیمەشق بنکەی سەربازی و سوپای دامەزرێندرا، سەڵاحەدین کوڕەکەی خۆی بە ناوی مەلیک ئەفزەڵ کردە سەرکردەی چەند هێزێک و سوپایەکی گەورەی پێ سپارد کە

پێکهاتبوون لە ١٢ هەزار ئەسپسوار و ١٣ هەزار پیادە و چەندان خۆبەخش، سوپایەکیشی بە کوڕێکی خوشکی سپارد بە ناوی تەقییەدینی عومەر و لە چەند شوێنێکەوە سوپای ئامادە کرد و سەرکردایەتیشی بە کەسە نزیکەکانی دەسپارد.

لە مانگی ئایاری ساڵی ١١٨٧ ناوچەی ناسرە لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕزگار کرا. سوپاکانی ئەیوبییەکان ڕووباری ئوردنیان لە باشووری تەبریا تێپەڕاند و یەکیان گرت. ژمارەی سوپای ئەیووبییەکان بە ٢٠ هەزار بۆ ٤٠ هەزار سەرباز و ١٢ هەزار سوارچاک خەمڵێندرا بوو و سەلاحەدینی ئەیووبی خۆی پێشڕە و ڕابەر و سەرکردەی سوپاکە بوو، هاوکات ژمارەی سوپای خاچپەرستان بە ٢٢ هەزار بۆ ٤٠ هەزار سەرباز و ئەسپسوار خەمڵێندرا بوو.

## هەڵگیرسانی جەنگی حطين:

دوای یەکگرتنی سوپاکان لە ناوچەی حەتین کە گوندێکی دەشتایی بوو لە ڕۆژاوای تەبریا، سوپاکە ئەو شوێنەیان کرد بە گۆڕەپانی جەنگ ناوچەکەیان لە دار و دەوەن پاک کردەوە، سەلاحەدین تەکتیکی ئاو گرتنەوەی لە دوژمن بەکارهێنا و هەموو سەرچاوە ئاوییەکانی لە سوپای خاچپەرستان بڕی و چاوگ و ڕووبارە ئاوییەکانی داگیرکرد، بۆیە ناچاری کردن کە بۆ دابینکردنی ئاو دابەزنە ناوچەیەکی دەشتایی نێوان حەتین و لوبییا، کاتێک ئەوان

دابەزینە دەشتاییەکانی ئەو ناوچەیە سوپای سەڵاحەدین هێرشیان کرد و سوپای خاچپەرستان هەڵهاتن بۆ سەر گردەکانی ناوچەی حەتین و لەلایەن سوپای موسڵمانانەوە گەمارۆدران.

لە ڕۆژی چواری تەمموزی ساڵی ١١٨٧ جەنگی حەتین هەڵگیرسا و هەر لە سەرەتاوە سوپاکەی سەڵاحەدین بەهێزتر بوو و جەنگەکە حەوت کاتژمێری خایاند و سوپاکەی سەڵاحەدین توانی سوپای خاچپەرستان بشکێنێت و بچێتە قودسەوە، توانییان پاشا گای دی لۆزینیانی پاشای قودس بە دیل بگرن و ژمارەیەکی زۆریان لە ئەفسەر و هێرشبەرە خاچپەرستەکان کوشت.

## دەرەنجامی جەنگی حطین:

جەنگی حەتین بە سەرکەوتنی موسڵمانان و شکستهێنانی خاچپەرستان کۆتایی پێهات، قودس و خاکی پیرۆز دوای ٨٨ ساڵ لە داگیرکاری خاچپەرستان ڕزگارکران و زۆرێک لە ناوچەکانی شام کە ژێردەستەی دەسەڵاتی خاچپەرستان بوون کەوتنەوە ژێر فەرمانڕەوایی ئەیوبییەکان و موسڵمانان. دوای ڕزگارکردنی قودس لە مانگی ئەیلوولی هەمان ساڵ ناوچەکانی غەززە و عەسقەلان و ناوچەکانی باشووری فەڵەستینیش ڕزگارکران. ئەم جەنگە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگی خاچپەرستی سێیەم کە بە ماوەی دوو ساڵ دوای جەنگی حەتین لە ساڵی ١١٨٩ ڕوویدا.

## سەرچاوەکان:

١ _ القائد صلاح الدين وتحرير بيت المقدس أضحى صلاح الدين القائد المنتصر في هذه المعركة على الصَّليبيين الذين سادوا العالم الإسلامي بأسره.

٢ _ س وج.. كل ما تريد معرفته عن معركة حطين فى ذكرى وقوعها؟ - اليوم السابع تمر اليوم الذكرى الـ832، على انتصار المسلمين بقيادة صلاح الدين الأيوبي على صلابي.

٣ _ صلاح الدين الأيوبي ومعركة حطين الفاصلة التحق صلاح الدين بخدمة عمه أسد الدين شيركوه، وكان أسد الدين مرافقاً لنور الدين؛ الذي تولَّى قيادة الزنكيين بعد مقتل والده، ويبدو أنَّ نور الدين أدرك قدرات صلاح الدين العسكرية.

٤ _ معركة حطين معركة فاصلة بين الصليبيين والمسلمين بقيادة صلاح الدين الأيوبي، وقعت في يوم السبت 25

٥ _ معركة حطين و فتح بيت المقدس صلاح الدين الأيوبي حرر بيت المقدس من الصليبيين دعمك لنا بالانتساب في القناة يساعدنا علي الاستمرار والأبداع

٦_
https://zaniary.com/blog/63ee848d81f27/%D8%AC%DB%95%D9%86%DA%AF%DB%8C-%D8%AD%DB%95%D8%AA%DB%8C%D9%86

٧ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان .

٨ _ د.علی صلابی : ژیاننامەی سوڵتان صەڵاحەدینی ئەیوبی .

# گەمارۆدان و ڕزگارکردنی قودس

سڵاحەدینی ئەیوبی دوای تەواو کردنی نەخشە سەربازیەکەی بەرەو ئامانجی سەرەکی کەوتە ڕێ ئەویش گەمارۆدانی شاری قودس و دواتریش ڕزگارکردنی.

سەرچاوەکان بەتایبەتی ئیبنو شەداد و قاضي فاضل و چەندینی دیکە ئاماژە بەوە دەکەن گرتنی قودس دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتەی کە سوڵتان صەڵاحەدین گرتیەبەر لەبەرامبەر نەساراکان و خەڵکانی دیکەی ناوچەکە لەکاتی شەڕەکانیدا، هەروەها ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ دانیشتوانی شاری قودسدا ئەنجامی دا.

خەڵکی هەموو دڵیان خۆشبوو وە هۆنراوەیان بەسەر سڵاحەدین دا دەوتەوە وە دەیانزانی میعراجی پێغەمبەرﷺ وە شوێنی پیرۆزی پێغەمبەران و جێگەی پیرۆزی باوکمان ئیبراهیم ئێستا تەوێڵەی ئاژەڵە! سڵاحەدینی ئەیوبی خۆی بۆ کۆدەکاتەوە و ئەو کەسانەی لەگەڵ سڵاحەدین بوون خۆشیان دەویست و دەیان ووت:لەبیرت بێت کە باپیرە گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت ئەم جێگەیەی ڕزگار کردووە بەبێ شەڕ،تۆش هەوڵیدا بەبێ شەڕ بیگریت، سڵاحەدینیش ئاواتی ئەوە بوو کە بیتول مەقدیس

بگرێت بەبێ شەڕ هەرچەندە خۆی ئامادە کردبوو بدات بەسەر

بیتول مەقدیسدا، واتا دەست بگرێت بەسەر قودسدا، بەڵام دایکێک بەگریانەوە ڕووەو سڵاحەدین دێتە دەرەوە و هاوار دەکات و دەڵێ: دوو کوڕم لای تۆ شەهید بووە، ئەم دوو کوڕەی من کە شەهید بووە یەکێکیان لەجەنگی تازەدا کوژراوە تەنها یەک منداڵ لە سکی

دایکیەتی،خۆت و سوپاکەت مەیەنە ناوەوە بۆئەوەی ئەم منداڵە لەدایک ببێت و نەوەکو دایکی لەترسی نەڕە و نرکەو زرمەی پێی ئەسپەکان لەباری بچێت .

سڵاحەدینیش بەقسەی ئەم دایکە پیرە دەکات لەبەر ئەم ئافرەتە

حامیلەیە سوپاکەی دوادەخات و هەموو سەرکردەکان لە سڵاحەدینی ئەیوبی کۆدەبنەوە و دەڵێن: تۆ چۆن واتکرد لەکاتێکدا هەموومان خۆمان ئامادە کردبوو بۆ ئەم جێگایە؟!

صڵاحەدینیش ئاواتە خواز بوو بۆئەوەی کە شەڕ نەکات و قودس تێک نەچێت بەهیچ شێوەیەک شەڕی تێدا نەکات، بۆیە لەوەڵامدا وتی: من فەتحی دڵی پیرەژنێکم کرد ئەو کاتە خوای گەورە فەتحی شارەکەم پێ دەدات! بۆیە هەرکەسێک لەدەوری سڵاحەدین بوو ئەوانەی ناو مزگەوتی قودسیش هەموویان هۆنراوەیان بەسەر سڵاحەدین دا دەوتەوە بەهەموو شێوەیەک خۆشەویستیان بۆ دەردەبڕی[1]. صڵاحەدینی ئەیوبی بەهێزاشی خۆی ئامادە کرد، چونکە نەیدەویست شەڕبکات بەهۆی ئەوەی جێگەکانی تری بەشەڕ گرتبوو هەردەیویست وەک خەلیفەی دووەمی ڕاشدین عومەری کوڕی خەتاب (ڕ.خ)بەبێ جەنگ ئازادی بکات.

صڵاحەدینی ئەیوبی بەهێزاشی خۆی ئامادە کرد، چونکە نەیدەویست شەڕبکات بەهۆی ئەوەی جێگەکانی تری بەشەڕ گرتبوو هەردەیویست وەک خەلیفەی دووەمی ڕاشدین عومەری کوڕی

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ل:٥١٢-٥١٣

خەتاب (ڕ.خ)بەبێ جەنگ ئازادی بکات.

خوای گەورە کردیە نسیبی سڵاحەدین ئەو شەوەی کە دڵی پیرەژنێکی ڕزگار کرد هەر ئەو شەوە بوو وایانزانی کە گەورەترین تاکتیکی بەکارهێناوە، وە زۆربەی زۆری سوپاکەی لەناو بیتول مەقدیسدا بوو بەجێی هێشت و گەڕانەوە بۆ ناوچەی "صور" وە بیتول مەقدیس بەتەواوی چۆڵکرا بۆیە هاتن پەیمانیان لەگەڵ سڵاحەدیندا بەست کە وتیان: ئێمە قودست پێشکەش ئەکەینەوە و وەرە ناویەوە ئێمە دەچینە دەرەوە،سڵاحەدینی ئەیوبیش ماوەی ٤٠ڕۆژی بۆیان دانا ووتی: ئەوانەی کە لەناو ئەم جێگەیەن خەڵکی ئەم شوێنە نین لەماوەی ٤٠ڕۆژدا دەچنە دەرەوە وە دەبێت پیاوانتان ١٠ دینار بدەن و ئافرەتان ٥ دینارو منداڵانتان ٢دینار دەدەن و ئەویتر کە پارەی نییە بەدیلی دەمێنێتەوە لای من.

---

ئەوەبوو هەموو خەڵکەکە کۆبوونەوە لەشەوی ئیسراو میعراج

لەڕۆژی هەینیدا لە ٢٧ ی،ڕەجەبی ٥٨٣ ی،کۆچی،یەکەم ڕۆژی

هەینی (محێدینی کوڕی زەکی)قازی دیمەشق،یەکەم کەس بوو لەسەر سڵاحەدینی ئەیوبی کە هاواری دەکرد لە قودسدا ٤ساڵ لەوەو پێش دەیوت: "فتحكم حلبا بالسيف في صفر، مبشر بفتوح القدس في رجب"

ئەوە بوو قسەکەی هاتە دی دوای ٤ساڵ کە ووتی:"حەلەبت بە شمشێر ڕزگار کرد لەمانگی سەفەر،مژدەت لێ بێت فەتحی قودس دەکەین لەمانگی ڕەجەب" قسەکەی محێدین هاتە دی، پاشان وتاری لە مزگەوتی ( اقصى)دا،وتارێکی ناسراوە لە مێژوودا باسکراوە کە

وتارێکی زۆر جوان و ناوازەیە لەوێدا دەست پێ دەکاتەوە لە وەحدانیەتو خۆشەویستی خوای گەورە.

دواتر مزگەوتی موسوڵمانان چاکدەکرێت وە کە قودس ماوەی نزیکی ١٠٠ ساڵ دەبێت تەوێڵەی ئاژەڵ بووە.

سەلاحەدین توانی بەتەواوەتی هەموو ناوچەکان ڕزگار بکات و بچێتە ناو خاکی قودسەوە.هەموو لاکان و جێگەکان هۆنراوەیان بەسەر ئەم پیاوە دا دەوتەوە و هیچ مێژوو نووسێک نەبوو بەخۆشیو شادی ناوی

ئەم پیاوە نەنوسێتەوە، کەس نەبووە لەو سەردەمەدا ئەم پیاوە لەدڵی دا، نەبوویێت بە کافر و موسڵمان و نەساڕاو تەتار و مەغۆلەوە، بەفارس و ڕۆمەوە بەهەر کەسێک دەبینیت باسی ئەویان کردووە[1].

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان،ل٥١٣ــ٥١٤

## دوا ساتەکانی تەمەنی صڵاحەدینی ئەیوبی

سوڵتان سڵاحەدین جارێدا بۆ حەج، داوای لە سەربازەکانی کرد کەوا

کێ بەتەمای حەجە ناوی تۆمار بکات، بۆئەوەی پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکرێت، سوڵتان سڵاحەدین خودی خۆشی زۆر تامەزرۆی حەجکردن بوو بەڵام خوای گەورە نەیکردە قسمەتی لەبەر سەرقاڵ بوونی بە تێکۆشان و بەرگری کردنی لە دەوڵەتی ئیسلامی.

صڵاحەدین لە "قاضي فاضل"ەوە، نامەیەکی پێ گەشت کە تێیدا باس لەوە دەکات کەوا گەشتی حەجی ئەمساڵی دوا بخات، چونکە دەوڵەت

پێویستیەکی زۆری بەو هەیە لەم قۆناغە ناهەموارەدا،بەهۆی ئەو کێشەو گرفتانەی کە دەوڵەت تووشی ببوون، سڵاحەدینیش ئەم ئامۆژگاریانەی گرتە گوێ و ڕۆشت بۆ قودس و فەرمانی دەرکرد بۆ (عیزەدین جۆردیک) خەندەق لێبدات بەدەوری قودسدا وە مزگەوتی ئەقصا نوێ بکاتەوە،هەروەها کاروباری داد و ئەوقافی ڕاسپارد بە "قاضي بهاء الدين"کوڕی شەداد.سڵاحەدین بەردەوام بوو لەگەڕان بەسەر شار و شارۆچکەکاندا دەگەیشت بە هەر ناوچەیەک فەرمانی دەکرد بە ئاوەدانکردنەوە و بیناسازی،دواتر ڕوویکردە دیمەشق کەماوەیەکی زۆربوو نەیبینی بوو وە زۆر دڵی بە دیمەشق دەکرایەوەو کوڕەکانیشی لەوێ بوون،ئەوە بوو سڵاحەدین گەیشتە دیمەشق و لەلایەن کوڕەکانیەوە پێشوازی لێ کرا[١].

ئیبنوو شەداد دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نامەیەکم پێ ڕاگەیشت لەلایەن سوڵتان

---

١ _ ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان،ل:٥٢٢

سڵاحەدینەوە تێیدا داوای لێ کردم بگەمە لای، ئەوەبوو منیش لە قودسەوە کەوتمە ڕێ کە بارانێکی زۆر باری بوو،ڕێگەش هەمووی قوڕ و لیتە و سارد بوو.ئیبنوو شەداد بەردەوام دەبێت و دەڵێت: صڵاحەدین زانی کە من گەیشتووم هات بۆلام و باوەشی پێدا کردم و دەستی کرد بە گریان،پرسیاری گەڕانەوەی حاجیەکانی لێکردم،داوای لێ کردم ڕێگە بۆ حاجیەکان پاک بکەمەوە لەو قوڕ و لیتەیە[1]. هەروەها ئیبنو شەداد دەگەڕێتەوە کەوا لە ١٤ ی، سەفەری ٥٨٩ ی کۆچیدا، سڵاحەدین ئاواتە خواز بووە بۆئەوەی بچێتە حەج، بەڵام گەڕایەوە بۆ دیمەشق لەوێ ماوەیەک مایەوە لەگەڵ کوڕ و براکانیدا.بەردەوام باس لەوە دەکات هەرچەندە ئارەزوومەند بووە بۆ حەج بەڵام لەبەر ئەوەی دەوڵەت لەژێر دەسەڵاتی بووە نەیوێراوە بڕوات نەوەکو لە نەبوونی ئەودا، دوژمن هێرش بەرێتە سەر دەوڵەتیان. بۆیە لە ١٤ ی، سەفەری٥٨٩ ی،کۆچیدا، ڕۆشت بۆ ئەوەی بەخێرهاتنەوەی حاجیەکان بکات، کاتێک حاجیەکان هاتنەوە لە مەککەی پیرۆز، سڵاحەدین یەک بە یەکیانی دەکرد بە باوەشەوەو دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتە خوارە کەوا چۆن ئاواتیحەجکردنی لەدەست دا، پاشان هەواڵی مەککە و ئەمیرەکەی و خەڵکەکەی و بڕی ئەو دانەوێڵەیەی کە لە میسرەوە پێیان دەگات و هەژاران و دەوروبەر و موچە و داهاتی لێ پرسین، حاجیەکانیش بەمە زۆر دڵخۆش بوون، لەناو حاجیەکاندا "سابقە الدين"ی، تێدا بوو کە یەکێک لە زاناکانی ئەوکاتە بووە،ڕێزی زۆری لێگرتن، چونکە پیشە و ڕەفتاری سڵاحەدین وابوو زۆر ڕێزی لە زاناکان دەگرت، برازاکەی سڵاحەدینیش لەگەڵ حاجیەکان بوو لە یەمەنەوە بوو،وە حاجیەکانیش زۆر شاد بوون بە بینینی سڵاحەدین کە کار ئاسانی زۆری بۆیان کردبود[2].

---

١ _ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ٥٢٢.

٢ _ صڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێرانی:جەمیل قادر،ل:٧٣٤

## نەخۆشکەوتنی صلاحەدین:

کاتێک شەوی شەممە هات هەستی بە ماندویەتییەکی زۆر کرد، هەر کە نیوە شەو هات تایەکی توند گرتی کە زیاتر لە سکیدا بوو،هەتاوەکو بەرەبەیانی شەممە ڕۆژ بووە بەتەواوی کاریگەری تاکەی پێوە دیار بوو، بەڵام ئەمەی بۆ خەڵکی ئاشکرا نەکرد، القاضي الفاضل و ئیبن شەداد لای ئامادەبوون وە الأفضلي کوڕیشی هاتە لای، قاضي ئیبن شەداد ئەڵێ: زۆر لای ماینەوەو نیگەران بوو لەوەی بەشەودا بێتاقەتی ڕووی تێدەکات وحەزی دەکرد قسەبکات لەگەڵ کەسانی نزیکیدا،پاشان بەجێمان هێشت بەڵام هەر دڵمان لای بوو،هەروەها ئەڵێت: لەو کاتەشەوە ئێمە بەیانی و ئێوارە سەردانیمان دەکرد و پاشان چەند جارێک لەگەڵ(القاضي الفاضل)دا، دەچووینە لای،هەندێک جاریش دەهێنرایە دەرەوە بۆ گەڕان و ڕۆیشتن لەکاتێکدا کە ئازاری کەم دەبوویەوە، وە نەخۆشیەکی زیاتر لەسەری بوو[1].

پزیشکەکان پێیان باشبوو دەماری سەری ببڕن و هەستان بە بڕینی لە چوارەم ڕۆژی نەخۆشیەکەیدا،بەڵام نەخۆشیەکەی توند تر بوو جەستەی وشک دەبوویەوەو هەناسەی سوار دەبوو،نەخۆشیەکەشی بەردەوام لە زیادبووندا بوو تاوەکو بەتەواوی لاوازی کرد.

لەشەشەم ڕۆژی نەخۆشیەکەی دا داماننناو پاڵماندا بەپشتییەکەوەوئاوێکی ساردی بۆهێنرا تاوەکو دوای شەربەتێکی

---

١_صلاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێرانی:جەمیل قادر،ل٧٣٤_٧٣٥

خۆش بخواتەوە، کە خواردیەوە زۆر بەگەرمی دەزانی ئێمەش بۆمان گۆڕی و ئاوێکی ترمان بۆی هێنا.

لەشەشەم و حەوتەم و هەشتەم ڕۆژدا نەخۆشیەکەی توندتر بوو هۆشی لەسەر خۆی نەما، لەڕۆژی نۆیەمیشدا تووشی لەرز بوو وازی لەئاو خواردنەوە هێناو پروپاگەندە لەشاردا بڵاوبوویەوەو خەڵکی ترسیان لێنیشت و قوماش و کوتاڵەکانیان لەبازاڕدا لابرد و هێندە غەم و خەفەت دایگرتن کەباس ناکرێت.لەڕۆژی دەیەمیشدا ئیبن و شەداد دەڵێت: دوو دەرزی لێدراو کەمێک پشوویدا وە ئازاری سوکبوو و ئەندازێك ئاوی جۆی خواردەوەو خەڵکیش زۆر دڵخۆش بوون و ئێمەش وەک هەمیشە تا شەوێکی درەنگ نەخەوتین،پاشان هەواڵمان پرسی و ئارەق قاچی و پاشان گشت گیانی گرتبوەوەو ئێمەش سوپاسی خوامان کرد و بەدڵخۆشیەوە ڕۆیشتین[1].

لەبەرەبەیانی یازدەهەمینی ڕۆژی نەخۆشیەکەیدا لەڕۆژی سێشەممە

٢٦ ی،سەفەر هاتینە بەردەرگا و هەواڵیمان پرسی،وتیان:عارەق

ڕاخەرەکەی ژێری تەڕکردووەو دایپاوەتە زەوی و وشکبوونەوە زۆری بۆ هێناوەو بەتەواوی لاوازی کردووەو پزیشکەکانیش هەستیان لەنزیک بوونەوەی وادەی مەرگی کردووە[2].

١ _ صڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،و:جەمیل قادر،ل:٧٣٥-٧٣٦

٢ _ النوادر السلطانيه، ل:٤١٩

# کۆچی دوایی صلاح الدینی ئەیوبی

ئیبن و شەدداد ئەگەڕێتەوە و ئەڵێت: هەر لەسەردەمی سلاحەدیندا و لەکاتی نەخۆشیەکەی کوڕەکەیمان کردە ئەمیر کە مەلیک ئەفضل بوو، ناسرابوو بە (نورەدین عەلی)کە کوڕە گەورەی بوو،ئەوەبوو سلاحەدین وەسێتی بۆی کردوو پێی ووت:کوڕی خۆم وەسێتت بۆ ئەکەم بەوەی لەخوا بترسیت لەبەرئەوەی سەری هەموو چاکەیەکە

وە فەرمانت پێدەکەم بەوەی خوا فەرمانی داوە کە بەجێی بهێنیت،

هەروەها وریای خۆتبە لەخوێن ڕشتن و چاولێکەری لەبەرئەوەی قەرزە و بەسەرتەوە دەمێنێت وە ئاگات لەدڵی خەڵک و کاروباریان بێت لەبەرئەوەی تۆ ئەمینی خوای بەسەر ئەوانەوە،چونکە ئەوەی من پێی گەیشتم هۆکەی دڵ ڕاگرتنی خەڵک بووە وە ڕق و کینەش لەکەس مەگرە، ئاگاداری خۆتبە لەنێوان خۆت و خەڵکدا،چونکە لێت خۆشنابن هەتا ڕازییان نەکەیت،بەڵام ئەوەی لەنێوان خۆتو خوادایە لێت خۆش دەبێت چونکە خودا کەریمە[1].

لەشەوی دوازدەیەمی نەخۆشیەکەیدا کە هاوکات بوو لەگەڵ ٢٧ی سەفەری ساڵی ٥٨٩ی، کۆچی ڕۆژی چوارشەممە بەرامبەر بە ١١٩٣ی، زاینی لەتەمەنی ٥٦_٥٧ ساڵیدا نەخۆشیەکی توندتر بوو بەتەواوی لاوازی کرد، پاشان ئەو شەوە سلاحەدین داوای کرد کە قورئانی بەسەردا بخوێنن،ئەوە بوو قورئانیان بەسەردا دەخوێند تاوەکو ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە خوای گەورە دەفەرموویێت:

١_ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان،ل:٥٢٣

﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾سورەتی(الرعد ٣٠)واتا: ((بێجگە لە اللە هیچ خوایەکی تر نیە، من هەر پشتم بەو زاتە بەستووە))[1].

سڵاحەدین زەردەخەنەیەکی کرد و بەپێکەنینەوە چاوەکانی لەیەک نا و ڕوحی بەرەو ئاسمان ڕۆشت وە ئەو ڕۆژە دوای نوێژی بەیانی بوو کە نوێژی بەیانی کردوو ماڵئاوایی لەم ژیانە کرد.

لەخەزێنەکەیدا تەنها یەک دیناری ئاڵتوون و سی و شەش درهەم وە دەشڵێن چل و حەوت درهەم بووە،نەماڵ نەخانوو نەبێستان نەکێڵگەو نەهیچ جۆرە موڵکێکی تری بەجێ نەهێشتووە لەدوای خۆی،ئەویش بەهۆی ئەو بەخشین و خێرکردنە زۆرەی بووە کە کردوویەتی.

---

١ _ صڵاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،و:جەمیل قادر،ل:٧٣٧




سەردانی گیڤارا بۆسەر گۆڕی سوڵتان سڵاحەدین لە دیمەشقی سووریا،ساڵی ١٩٥٩



سەردانی ڤلادیمێر پۆتینی سەرۆک ڕوسیا، بۆسەر گۆڕی سوڵتان صڵاحەدینی ئەیوبی

# زومرود خاتوون

باسەکەی ئەم جارەشمان هەر لەناو بنەماڵەی ئەیوبیەکان دەبێت،

باسەکەمان لەسەر کار و بەشێکی کورتی ژیانی زومرود خاتوونی خوشکی سوڵتان صەڵاحەدینی ئەیوبی ئەبێت.

ناوی تەواوی: زومرود خاتوونی کچی (نجم الدینی کوڕی شادی کوڕی مەڕوان)ە.

زومرود خاتوون یەکێکە لە پزیشکە ئافرەتەکانی شارستانییەتی ئیسلامی و بەناوبانگترین ئەو خانمانەی کە لە زانستی پزیشکیدا

جێ دەستیان دیار بووە،دامەزرێنەری یەکەم نەخۆشخانەی سەربازی ئەو سەردەمەیە و خوشکی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبییە و باوکی نازناوی باشترین مەلیکی پێدراوە بەهۆی دڵسۆزییە بێوێنەکانیەوە، بەخۆشی دایکی هەژاران و ستەمدیدەکان و پارێزگاری زانست و خەمخۆری زانست دۆستان بووە، هاوشێوەی سەلاحەددینی برای نێردراوەتە بەرخوێندن ئەم خاتوونە بەهۆی نەرم و نیانی و زیرەکیە لێهاتوویەکەیەوە جێگای خۆشەویستی زانایان و هەژاران بووە،

سەرەتا بە زانستە دینیەکان دەستی بە خوێندن کردووە و شارەزای باشی زانستی قورئان و فەرمووده و فیقهـ بوە، تاوەکو بۆتە یەکێ لە زانایانی بواری مەزهەبی شافیعی و دەرسی وتۆتەوە.

لەساڵی «٥٨٢»کۆچی، هەستا بە بنیادنانی قوتابخانەی (شامە بەرانییە)، کە بە قوتابخانەی (حسامیە)ش ناسراوە.

ئەم خاتوونە هەر بە زانستە شەرعییەکان نەوەستاوە، بەڵکو لە بواری زانستی پزیشکیدا دەستی بە خوێندن کردووە و چەندین جۆر دەرمانی بەکارهێناو، کە بەمەش بە یەکەم ئافرەت دادەنرێ

کاری دەرمانسازی کردبێت.

زومرودخان شوی بە کوڕە مامی خۆی (ناسرەدین) کردووە، کە هەمیشە پاڵپشت و پشتیوانی کارەکانی بووە و ڕێگری لێنەکردووە و هانی داوە لەسەر کارەکەی بمێنێتەوە، ئەم خاتوونە کە سوڵتان سەلاحەدین بە باشترین کەسی نزیکی خۆی ناوی بردووە، پشتیوانی لە سوپای موسڵمانان کردووە، بە دروستکردنی دەرمان و سەرپەرشتیکردنی برینداران و چارەسەرکردنیان.

بەم جۆرە لە خزمەتی موسڵمانان دابوو، تا لە ڕۆژی هەینی ١٦ی ذولقەعدەی ساڵی (٦١٦)کۆچی، وەفاتی کرد و لە قوتابخانەی (ئەلبرانییە) نێژراوە..

---

سەرچاوەکان:-

١ _ کتێبی (١٠٠١ داهێنان لە کەلەپووری زانایانی موسوڵمان) بەڕێوەبەری نووسین: پرۆفیسۆر سەلیم حەسەنی، وەرگێرانی: جوتیار قارەمان.

٢ _ https://nektar.co.at/arab/?p=3293

# زەریاب داهێنەرێکی مەزن و ناوێکی وون

ناوی تەواوی( حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی نافع) (لەدایکبووی ساڵی(789 زاینی)یە. هەروەها لەساڵی( 857)زاینی، کۆچی دوایی کردووە، لەشاری موسڵ لەدایک بووە. لەسەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشید خەلیفەی پێنجەمی عەبباسیەکان ژیاوە و دواتر چووەتە ئەندەلوس کە ئیسپانیایی ئێستا دەکات، هەر لەوێش لەساڵی ٨٥٧ی، زاینی کۆچی دوای کردووە.

نازناوی زەریابە واتا باڵندەی ڕەش، ئەمەش بەهۆی دەنگە دڵنشین و خۆشەکەی و پێستە ڕەشەکەیەوە بوو، هەندێکیش لایان وایە کە زەریاب (زۆراب) ی کوردی یان (زەڕیاو/زڕیاو) (ئاوی زێڕ) بووبێت و ئەو سەردەمە کە زمانی پەهلەوی بۆ نووسین بەکارهاتووە، پیتی (و) ی کوردی وشەی (ئاو) کرابێتە (ئاب) ی پەهلەوی و ناوەکە لە (زەڕیاو/زڕیاو) وەوە کرابێتە (زەریاب). زەریاب سێزدەسەدە بەر لە ئێستا و لە دەورووبەری ساڵانی 789ی زایینی لە موسڵ لەدایک بووە، هەر لە منالّیەوە بەهرەکانی دەنگ خۆشی تێدا بەدەر دەکەون، بۆیە دەچێتە خوێندگای مۆسیقا لە موسڵ کە ئیسحاق موسڵی سەرپەرشتی دەکرد، هەر زوو ئیسحاق موسڵی هەست بە لێهاتووی زەریاب دەکات بۆیە جیاواز لە قوتابییەکانی تر لەوی دەڕوانی و گرینگی زیاتری پێدەدا.

# ڕەچەڵەکی زەریاب

مێژوونوسان زۆر لەبارەی ڕەچەڵەکی زەریابەوە نەدواون، بەڵام زۆربەی ئەو مێژوونوس و ڕۆژهەڵاتناسانەی کە باسیان لە ڕەچەڵەکی زەریابەوە کردووە، زەریابیان بە کورد داناوە، هەرچەندە هەندێک مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناس لەپەنا ناوی کورد، فارس و عەرەب و تەنانەت ئەفریقاییش دەنووسن، بەڵام باشترین شتێک بۆ یەکلاکردنەوەی ڕەچەڵەکی زەریاب لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر مهیمن ابراهیم جزراویة کە بەزمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە بەناوی (زریاب منجازاته وأبرز مبتكراته الموسيقية.

دکتۆر مهیمن لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دەڵێت:من گەڕاوم لە هەندێک سەرچاوە و بەڵگە و مێژوویەکان و لێکۆڵەرەوان و زانایانی بیانی و ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر ڕەچەڵەکی زەریاب، گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە ڕەچەڵەکی زەریاب کورد بووە.

دواتر وتەی چەند مێژوو نووس و ڕۆژهەڵاتناس دێنێتەوە کە باس لە کورد بوونی زەریاب دەکەن.. ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (تۆما بوا) دەڵێت: مۆسیقا ژەنی ناسراو زەریاب کە ژێی پێنجەمی بۆ عود زیادکرد لە سەردەمی عەباسیەکاندا ئەو لە ئەسڵدا کوردبووە ڕۆژهەڵاتناس شوالتزا دەڵێت:زەریاب گەنجێکی کورد بوو کە یەکێک بوو لە بلیمەترین خوێنکارەکانی ئیسحاق موسڵی کە بە توانا لە حەد بەدەرەکانی لەبواری مۆسیقادا ناوبانگی دەرکردبوو.

خانمە دکتۆری ئەڵمانی (زیگرید هونکە) دەڵێت: کوڕە گەنجێکی کورد بەناوی زەریاب قوتابی بوو لە خوێندنگای مامۆستا ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی موسڵی، ئەو توانیەکی زۆر بەرزی هەبوو لە زانستەکانی مۆسیقادا.

## کار و چالاکیەکانی لە ئەندەلوس(ئیسپانیا)

خانمە دکتۆری ئەڵمانی (زیگرید هونکە) دەنووسێت:

کوڕە گەنجێکی کورد بەناوی زەریاب قوتابی بوو لە خوێندنگای مامۆستا ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی موسڵی، ئەو توانایەکی زۆر بەرزی هەبوو لە زانستەکانی مۆسیقادا.

هەر چەندە ئیسحاق موسڵی لەوە دەترسا کە زەریاب کاریگەری لەسەر ناوبانگی ئەو دروستبکات بەڵام ئەو وای بیر دەکردەوە کە زەریاب تەنها ئاواز و گۆرانیەکانی ئەو دوبارە ئەکاتەوە، بۆیە وای دەزانی کە ئەم جۆرە هونەرمەندە تازە پێگەیشتووە گەر ناوبانگیش دەربکات هیچ مەترسیەکی نییە لەسەر ناوبانگی خۆی، لای وابوو کە ناوبانگی ئەو زیاتر دەبێتە هۆی دەرکردنی ناوبانگی خۆی و پاڵپشتێک بۆ خوێنگاکەی.

هاڕونەڕەشید داوا لە ئیسحاق دەکات کە گۆرانیبێژێکی نوێیان بۆ بنێرێ کە تا ئەکات گوێی لە دەنگی وا نەبووبێت، ئەمیش باسی زەریابی بۆ دەکات و بۆی دەنووسێ: لە ماڵی خۆما خوێندکارێم هەیە پێی دەڵێن زەریاب، کە دەنگ و سەدایەکی خۆشی هەیە، ئەمە هەڵبژاردی منە بۆ تۆ هاڕونە ڕەشید ئەمەی زۆر پێ خۆش دەبێت چونکە لە گۆرانیبێژە کۆنەکانی بێزار ببو، بۆیە داوای لە ئیسحاق کرد کە بۆیی بێنێ.

کە ئیسحاق و زەریاب گەیشتنە کۆشکی خەلیفە، زەریاب لەبەردەم هاڕونە ڕەشیدا دەستی کرد بە خوێندنەوەی شعر و پیاهەڵدان و گۆرانی وتن، هاڕونە ڕەشید زۆر لای خۆش دەبێت، ڕوو دەکاتە

ئیسحاق و پێی دەڵێت: گەر باوڕم بە تۆ نەبوایە، بەوەی کە پێشتر تۆ ئەم دەنگەت نەبیستووە، سزام دەدای بەوەی کە تا ئێستا پێت نەناساندوم، چاوت لێی بێت و گرینگی پێ بدە تا کاتێکی تر ئەیبینمەوە چونکە من شتی زۆری لێ چاوەڕوان دەکەم.

کە زەریاب کۆشکی بەجێهێشت کەوتە خەیاڵ و بیرکردنەوە بەوەی کە خەریکە جیهان ڕووی تێدەکات ئەستێرەی بەختی وا خەریکە دەگەشتێتەوە، بەڵام ئەو خەیاڵە جوانەی زۆری نەخایاند و بوو بە مایەی دەرد و بەڵا بۆی.

ئیسحاق ئەوەی لێی دەترسا خەریک بوو ڕوویدەدا، هێدی هێدی زەریاب ناوبانگی زیاتر دەبوو ئەمەش کاریگەری کردبووە سەر ناوبانگی خۆی.

بۆیە هەر زوو وتە خۆش و هاندەرەکانی ئیسحاق بوون بە خەنجەر و ئەیخستنە دڵی زەریابەوە، کاتێک لێک جیابوونەوە ئیسحاق بە زەریابی وت:لە ڕاستیدا بەخیلی کۆنترینی دەرمانەکانە، وە جیهانیش زۆر ئاژاوەگێرە، هاوبەشی لە پیشەدا وەک دژایەتی وایە، لە ڕاستیدا تۆ فێڵت لێم کرد کە پلە و پایەی خۆت بەسەر مندا بەرز کردەوە، وە ئەگەر من خۆم بە کەمتر لە تۆ ببینمەوە و پلە و پایەم داببەزێت وە تۆ لە من زیاتر ناوبانگ دەربکەی لەمە هەرگیز هاوڕێیەتیت ناکەم گەرچی کوڕی خۆشم بیت، ئەگەر تۆ خوێندکاری خۆشم نەبووبای دڵنیابە لەوەی لەناوم دەبردی، ئێستاش دوو ڕێگات لەبەردەمە یان ئەوەتا ڕێگایەکی دوور دەگریتە بەر کە هەرگیز هەواڵت نەبیستمەوە، یاخود هەوڵی لە ناوبردنت دەدەم. کاتێک زەریاب گوێی لەو وتانەی ئیسحاق بوو هەر زوو درکی بە مەترسی کرد لە سەر ژیانی،

بەناچاری بە پێشنیارەکانی ئیسحاق ڕازی بوو، زەریاب بە یەکجاری ماڵئاوایی لە وڵات و نیشتیمانەکەی لە هاوڕێ و خۆشەویستەکانی کرد و لە یەکێک لە شەوە جوانەکانی بەغدا لەگەڵ خێزانەکەی وڵاتی بە جێهێشت و بەرەو ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی کۆچی کرد تا لە کۆتاییدا لە ئەندەلوس (ئیسپانیای ئێستا) شاری قورتوبە خۆی بینیەوە، لەوێ لەلایەن خەڵک و تەنانەت خەلیفەشەوە پێشوازیەکی باشی لێکرا و هەر زوو و پلە و پایەی بەرز کرایەوە.

ڕاستە زەریاب ئەستێرەی بەختی لە بەغدا کوژایەوە، بەڵام لە قورتوبە بەرە بەرە دەدروشایەوە، کتێبی 1001 داهێنان لە کەلەپووری موسڵمانان دەنووسێت: زەریاب لە کاتێکی گونجاودا گەیشتە ئەندەلووس، چونکە ئەو ماوەیە خەلیفە بەخشندەیی و سەخاوەتێکی زۆری هەبوو بۆ هونەر، وە هونەرەکانی زەریاب لەوێ دراوشایەوە و ئەویش دانی پێدا نا، زەریاب بوو بە گۆرانیبێژی وڵات و موچەیەکی بە بڕی 200 دینای زێری مانگانەی بۆ بڕایەوە لەگەڵ چەندین خەڵات و بەخششی تر.

نوسەری کێتێبی 1001 داهێنان لە کەلەپوری موسڵمانان دەنووسێت: زەریاب نرخێکی نە خەملێنراوی بەخشی بە هونەرەکەی ئەم ئەرزش و بەها بێ وێنەیە بە درێژایی هەزار ساڵ دواتر بەردەوام مایەوە تا خەڵکی لە سەرەنسەری جیهاندا چێژ وەربگرن لە شێوازە جیاواز و جۆرا و جۆرەکانی مۆسیقای ئەو سەردەمە.

مامۆستای ڕەوشت، کاتێک زەریاب بینی خەڵکی ئیسپانیا و ڕۆژاوا لە چاو ڕۆژهەڵات لەڕووی ڕەوشتی هەڵسوکەتکردن و جل و بەرگ لە ئاستێکی نزمدان هەوڵی فێرکردنی خەڵکەکەی دا، کە خەڵکەکەش ئەویان بە پێشەنگ و پێشەوای خۆیان دەزانی بە گوێیان بۆ دەگرت و لاسایان دەکردەوە.

# هەزار و دووسەد ساڵ دوای زەریاب

مێژوونووسی فەڕەنسی هێنری تێرەیس دەڵێت: زەریاب شێوازی جل و بەرگی زستانە و هاوینەی ناساند وە بە وردی ئەو ڕۆژانەشی دیاری کرد کە دەبێت چ جۆرە جل و بەرگێک بپۆشرێت، هەروەها پۆشاکی نیو وەرزەشی زیاد کرد کە گونجاو بوو بۆ ماوەی نێوان دوو وەرزی جیاواز، وە پۆشاک و بەرگی جوان و سەرەنجڕاکێشی ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ ئیسپانیا، لە ژێر کاریگەری ئەودا پشەسازی جل و بەرگ سەریهەڵدا کە جل و بەرگی هێڵ هێڵی ڕەنگاو ڕەنگ و چاکەتیان لە کووتاڵی ڕوون دروستدەکرد.

نوسەری کتێبی 1001 داهێنان لە کەلەپووری موسڵمانان دەنووسێت: ئەگەر ئەمجارە بۆ کڕینی دواهەمین مۆدێل و شێوازی پێڵاو چوویت بۆ فرۆشگایەکی شیک و گرانبەها و ویستت پانتۆڵ یان کراسێکی هاوینە تاقی بکەیتەوە ئەوا زەریابی بەر هەزار و دووسەد ساڵ بهێنەوە بیری خۆت، چونکە بەهۆی ئەوەوە بیرۆکەی بەرهەمهێنانی ئەو پێڵاو و پۆشاکانە لە ڕۆژهەڵاتەوە لە شەققەی باڵی دا بەرەو ڕۆژاوا..

هەروەها نوسەری کتێبی 1001 داهێنانی موسڵمانان دەنووسێت:

دەکرێت سوپاسی پیاوێکی سەدەی نۆیەمی زایینی بکەین بەناوی زەریاب، کە بیرۆکەی سێ ژەم خواردنی بە ئەوروپا ناساند، کاتێک گەیشتە ئەندەلوس (ئیسپانیا) دابونەریتەکانی تایبەت بە خواردن بەشێوەکی گشتی گۆڕانی بەسەرداهات، وتی: دەبێت ژەمی خواردن

بە شۆربا دەست پێ بکات و بە دواییدا خواردنی سەرەکی بێت کە گۆشتی ماسی یان گۆشتی سوور یان گۆشتی باڵندەی تێدابێت وە بە جۆرێک لە میوە یان جەرەزات کۆتایی پێ بهێنرێت.

جەیسۆن وێبسەر لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ کەناڵی بی بی سی لە بەرنامەی مێژوویەکی ئیسلامیانەی ئەورۆپا لە بارەی زەریابەوە دەڵێت: زەریاب هەموو شێوازەکانی پۆشاک و خۆڕازاندنەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەغدای ئەوکات نیۆرک و پاریسی ئێستا بوو، ئەو مەعجوونی ددان و بۆنبەری جەستە و شێوازی قژی کورتی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ قورتوبە، ئەوە ڕاستیەکەیە کە لەو سەردەمەدا لەشاری قورتوبەدا کۆڵانەکانی چرای ڕووناکەرەوەیان تێدا بوو و زێرابی ئاو و پاشەڕۆ هەبوو وەهەروەها جۆگەلەی ئاوی پاک بۆ ماڵان دەچوو، بەغداد لە عێراق گەورەترین ناوەندی هزری و فەرهەنگی بوو لە جیهانی ئیسلامیدا، زەریاب لەوێوە شێوازی نوێی ڕازاندنەوە و ئامادەکردنی مێزی نانخواردن و دیزاینی نوێی جل و بەرگی پیاوانە و تەنانەت یاری شەترەنج و پۆلۆی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ قورتوبە، ئەو ناوبانگی دەرکردبوو بە پیاوێکی سەلیقە جوان کە بەردەوام باشترین بژاردەی هەیە ناوی دەرکردبوو بە شیک پۆشی و ڕازاوەیی بە دیزاینە دانسقە جوانەکانی دەرباری خەلیفەی دەڕازاندەوە لە هەمان کاتدا خەڵکی قورتوبەش لاسایی لە شێوازی قژبڕینی کورتی ئەو دەکردەوە و چێژیان وەردەگرت لەو کەلووپەلە پێستیانەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنای بۆ ئیسپانیا.

## کاریگەری زەریباب بەسەر ئەورووپاوە

زەریاب لە زۆرێک لە بوارەکاندا یەکێک بوو لە بەناوبانگترینی ڕۆژگاری خۆی، وە تاوەکو ئێستاش کاریگەری داهێنانەکانی لەسەر جیهان بەجێماوە، بەتایبەت بەسەر ئەوڕوپایەکانەوە چونکە وەک خۆیان دەیڵێن بەهۆی زەریابەوە بەشێکی زۆری داهێنانەکانی شارستانیەتی ئیسلامی گواسترانەوە بۆ ئەوڕوپا و هۆکارێکی گرینگ بوو بۆ ڕزگاربوونی ئەوڕوپا لەتاریکی و نەزانی، داهێنانی زەریاب زۆرن کە کاریگەریان لەسەر ئەوڕوپا دروستکردووە بەڵام لێرە بەشێک لە داهێنانەکانی دەخەینە ڕوو:-

### داهێنانەکانی زریاب:

- لە ژێر کاریگەری زەریابدا پشەسازی جل و بەرگ لە ئەورووپادا سەریهەڵدا.

- یەکەمین پەیمانگای هونەری لە جیهاندا دامەزراند.

- مەعجونی ددانی پێیان ئاشناکرد.

- یاری شەتڕەنج و پۆلۆی ئاشناکرد بە ئەورووپا.

- خواردنی سێ ژەمەی بە ئەورووپا ئاشناکرد.

- بۆنبەری جەستە و شێوازی قژی کورتی بە ئەورووپا ئاشناکردو داهێنەری تەسریحەی پرچ و برین و چاککردنیەتی.

- جلوبەرگی هاوینە و زستانەی بە ئەورووپا ئاشناکرد وئەو ڕۆژانەشی دیاریکرد کە دەبێت چی جلوبەرگێک بپۆشرێت.

- بیرۆکەی پەردەی سەر مێزی بڵاوکردەوە.

- پەرداخە کانزاییە قورسەکان و دەفرە ئاڵتوونیەکان کە بۆ تێدا خواردنەوە بەکاردەهاتن، گۆڕی بۆ پەرداخ و دەفری بلووری.

- هەروەها بۆیەکەمجار شیرینی(زلۆبیا)ی، داهێنا لە ئەندەلوس

بۆیە خەڵکەکەش ناوی شیرینیەکەیان نا (زریابیە) کە لەناوی (زریاب)ەوە، وەریانگرتووە و دواتر بووە(زلابیە/زلۆبیا).

-پۆشاکی کەڵاوداری بۆ دادوەرانی ئەندەلوس دروستکرد، بۆیەکەم جار دیزاینی پۆشاک و پێڵاوی گۆڕی و پەرەی پێدا و بەجیهاندا بڵاوبووە و دواتر ئەو پۆشاکی کەڵاودارە بووە پۆشاکی فەرمی مەغریبییەکان و هەروەها ڕاپەرەکانیش لەبەری دەکەن.

- داهێنەری موقەبیلاتە لە دەفری شوشەدا.

- داهێنەری ئادابی گشتی خواردنە لە جیهاندا.

- تەرێکی بۆ ئامێری عود زیادکرد.

**ئەمانە بەشێک بوون لە داهێنانەکانی زریاب.**

سەرچاوەکان:-

١_ _ کتێبی (١٠٠١ داهێنان لە کەلەپووری زانایانی موسوڵمان) بەڕێوەبەری نووسین: پرۆفیسۆر سەلیم حەسەنی، وەرگێرانی: جوتیار قارەمان.

٢_https://kurdipedia.org/default.aspx?lng=1&q=20120522224145 64847

٣_ هەروەها دکتۆر (زیگرید هۆکە) ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی لەکتێبەکەی بەناوی (شمس العرب تسطع الغرب) لەلاپەڕەی ٤٨٨ باس لە کوردبوونی دەکات سەبارەت بە کوردبوونی زۆر بەڵگەمان لەسەرەتایی بابەتەکەوە خستوەتە ڕوو..



وێنەی کێشراوی زریاب

## وەستا ڕەجەب

لەکۆتایی بەشی یەکەمی کتێبەکەمدا پێم خۆشبوو کەمێک بەکورتی لەسەر خاڵە ڕەجەب بدوێم، کە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لەناو مێرنیشنی سۆراندا،ئەویش لەڕێگەی بەهێزکردن و دروستکردنی چەک و تۆپەوە بۆ ئیمارەتەکەی میر محەممەدی سۆران.

وەستا ڕەجەب کوڕی (میر ئەحمەد)ە، خاڵە ڕەجەب یەکێک بووە لەو کەسانەی کە تۆپی دروست کردووە بۆ ئیمارەتەکەی میر محەممەدی سۆران ناسراو بە (پاشای گەورە) یان( پاشای کۆرە) لە ڕەواندز.

ڕەواندز لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد ناسراو بە پاشای کۆرە، خاوەنی کارگەی چەك و جبەخانە و خەنجەر بووە، هەر لەم کارگەیەدا دراو و شمشێر و کەل و پەلی ناوماڵ و ڕاکێشانی سکەی دراوی لێ دروست دەکرا، ئەمەش وەك چەکی بەرگری لە میرنشینەکەی کە تەمەنی فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی زیاتر لە ٢٠ ساڵی خایاندووە. لە ساڵی ١٨١٣ کاتێك میر محەمەد دەبێتە میری میرنشینی سۆران شارەزایەکی بواری ئاسنگەری بەناوی وەستا ڕەجەب دەنێرێتە وڵاتی فەڕەنسا هەندێک لە سەرچاوەکان ئەڵێن ناردی بۆ ڕووسیا، بەهەرحاڵ بۆ یەکێک لەو دوو وڵاتە ناردی بۆ فێربوونی دروستکردنی چەك، وەستا ڕەجەب فێری دروستکردنی تۆپ دەبێت کە لە دواجاردا ئەم تۆپانە وەك چەکی سەرەکی لەشەڕەکاندا بەکارهاتووە. وەستا ڕەجەب دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨١٣ دەچێتە فەڕەنسا یان ڕوسیا و دەگەڕێتەوە، تۆپی دوور هاوێژ دروستدەکات، بەم هۆیەشەوە میرنشینی سۆران لە ڕیزی میرنشینە بەهێزەکاندا بووە لە چەکی قورس و خاوەنی زیاتر لە ٢٠٠ تۆپی دەستی وەستا ڕەجەب بووە.

(١٨١٣ – ١٨٣٧ ز ) کارگەی دروستکردنی چەکەکان کە لەلایەن وەستا ڕەجەبەوە سەرپەشتی دەکرا،لە کاولۆکان بووە.

دوای ڕوخاندنی میرنشینی سۆران و کوژرانی میر محەممەد، لەسەر دەستی عوسمانییەکان، تۆپەکانی وەستا ڕەجەب لەناو دەبرێن و فڕێ دەدرێنە ناو ڕووباری خەرەندی ڕەواندز، مێژووناسان لەم ڕووەوە دەڵێن "لەبەرئەوە تۆپەکان فڕێدراونەتە ناو ڕووباری خەرەند بۆ ئەوەی هێزەکانی ڕکابەری عوسمانییەکان سودی لێنەبینن، هەروەها دەوترێت ڕووسەکان خۆیان تۆپەکانیان بردووەتەوە بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان و هاوپەیمانەکانیان عوسمانیەکان وا هەست نەکەن کە ڕووسەکان هاوکاری میرنشینی سۆرانیان کردووە". دوای هاتنی سەید تەهای شەمزینی لە ساڵی ١٩٢٣ یاخود ساڵی ١٩٢٦ وەک یەکەم قائیمقامی شارۆچکەی ڕەواندز هەوڵی داوە تۆپەکان بدۆزێتەوە بەڵام تەنها سێ دانەیانی بۆ دۆزراوەتەوە، لە ڕەواندز و هەولێر و کۆیە پارێزراون.

تۆپەکانی وەستا ڕەجەب لە سێ جۆری سەرەکی پێک هاتبون ئەوانیش:- (بچوک، مامناوەند، گەورە).

ئەو تۆپەی ئێستا لە ڕەواندزە لە جۆرە بچوکەکانە و درێژی تۆپەکە

( 120سم) دەبێت جگە لە دەسکەکەی دواوەی تۆپەکە، وە کێشی تۆپەکە (2قەنتارە) واتا (200کگم)، لە سەردەمی کۆن و ئێستاشەوە هەردەم ڕووی تۆپەکە کراوەتە ووڵاتی تورکیا ئەمەش وەک ڕەمزێک بۆ دڕندەی و خوێنڕێژی بەردەوامی تورکەکان.

ئەو دوو تۆپەی تریش کە دەرهێنرانەوە ئێستا دانەیەکیان لە بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری هەولێرە و دانەیەکی تریشیان لە شاری کۆیەیە ...

هەروەها مەلا و مزگەوتەکانیش لە دوای دۆزینەوەی تۆپەکان، خەڵکی ڕەواندز لە مانگی ڕەمەزاندا بەکاریانهێناوە بۆ بەربانگ و هەروەها کاتی جەژنەکانانیش بەکارهێنراوە، تۆپەکەی وەستا ڕەجەب تا ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردووش وەک نەریتێک بۆ بەربانگ بەکارهێنراوە. ساڵح محەمەد کەسایەتییەکی ڕەواندزە و یەکێکە لەو کەسانەی کە لە ساڵانی شەستەکان لەگەڵ ئەو کەسانە بەشدار بووە کە تۆپەکەیان لەمانگی ڕەمەزاندا تەقاندووە و دەڵێت "هەموو ئێوارانی مانگی ڕەمەزان هەموو کەسێك دەهاتە لای تۆپەکەی وەستا ڕەجەب، هەرکەسێك پارچە قوماش و جل و بەرگی کۆنیان دەهێنا و لەگەڵ بارووت دەیانخستە ناو لولەی تۆپەکە، لەگەڵ ڕۆژئاوابوون ڕاستەوخۆ دوای ئەوە مەلای مزگەوت بانگی دەدا دەیان تەقاند و دەبوە بەربانگ کردنەوە".

---

سەرچاوەکان:-

١ _ کتێبی (وەستا ڕەجەب چەکسازی بلیمەتی) نوسینی:جەواد ساڵح نەورۆز.

٢_ئەزمونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان.

٣_https://zaniary.com/blog/62acfbd1e85e3/%D8%AA%DB%86%D9%BE%DB%95%DA%A9%DB%95%DB%8C-%D9%88%DB%95%D8%B3%D8%AA%D8%A7-%DA%95%DB%95%D8%A

# کۆتایی بەشی یەکەم

لێرەدا هاتینە کۆتایی بەشی یەکەمی کتێبەکەم کەپێکهاتبوو لە چەند دانا و گەڕیدەو تێکۆشەر و هەروەها کەسایەتیەکی کوردی موسڵمان، کە تێیاندا بەکورتی تیشکم خستبووە سەر ژیان و داهێنان و ڕۆڵیان بەپشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەک،وە لەبەشی دووەمی کتێبەکەمدا باسی بەشێک لە ژیان و ڕۆڵ و کاریگەری و جێ پەنجەی چەند زانایەکی ئاینی و مێژوونووس و کەسایەتیەکی کوردی موسڵمان دەکەم.

# یەکەم مێژوونووسی شاری هەولێر

لەبەشی دووەمی کتێبەکەدا پێمخۆشبوو زۆر بە کورتی لەسەر کەسایەتی و زاناو مێژوونوسی کورد "ئیبن مستەوفی"بدوێم بۆتان، زۆربەمان پەیکەری ئەم زانا کوردەمان بەرچاو کەوتووە بەبێ ئەوەی بیناسین و ناوی بزانین، هەر کەسێک چووبێتە شاری هەولێر و سەردانی قەڵاتی کردبێت وە یاخود لە سەر (تی ڤی)یەکان، وەیاخود لەناو مۆبایل وە یان بەوێنە یان هەر شتێکی دی، پەیکەری ئەم زانا کوردەی بەرچاو کەوتووە کە لەلای قەڵای هەولێرە لە سەرەتای چوونە ژوورەوەدا لە دەرگای یەکەمی قەڵاکە پەیکەرێکی گەورەی لێیە کە لەسەر کورسیەک دانیشتووە و کتێبێکی گەورەی بەدەستەوەیە سەرەنجی لەسەر کتێبەکەی ژێر دەستیەتی یاخود خەریکی خوێندنەوەیەتی، ئەو پەیکەرە گەورەیە ئەم زانا کوردەیە کە بە (ئیبن مستەوفی) ناسراوە.

ئیبن مستەوفی، یەکێک بوو لە بەناوبانگترین توێژەرەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، بە یەکەم مێژوونووسی شاری هەولێر دادەنرێت، رەمزێک بووە لە رەمزەکانی کارگێری شارەکە لە سەردەمی خیلافەتی ئیسلامیدا[1].

---

_١ https://new.zadyreman.com/detailnews.aspx?jimare=1527&babet=52

## ئیبن مستەوفی کێیە؟

لەقەڵای هەولێر بنەماڵەیەکی خانەدان و زانا و دانا هەبوو بەناوی بنەماڵەی (مستەوفی) لەناو ئەو بنەماڵەیەدا منداڵێک لەدایکبوو لەناو قەڵای هەولێردا لەساڵی (٥٦٤ک – ١١٦٩ز)بەناوی: (مبارك احمد شرف الدين اللخمي) کە دواتر ناسرا بە ئیبن مستەوفی ئەربیلی،ئەم منداڵە گەورە دەبێت و دەبێتە کەسایەتیەکی کاریگەری زانستی و مێژووی و سیاسی، ئەم زانایە مێژوونووس و هەروەها وەزیری سوڵتان موزەفەرەدین[1] بووە لە شاری هەولێر.

بنەماڵەی (ئیبن مستەوفی) یەکێکن لەو بنەماڵانەی کە لەسەردەمی "هەزبانییەکان"[2] لەموسڵەوە هاتوونەتە شاری هەولێر.

ئەم بنەماڵە بەڕێزە پێش ئەوەی (موزەفەرەدین) دەسەڵات بگرێتە دەست و ئیمارەتەکەی دروست بکات هاتوونەتە شاری هەولێر و لەناو قەڵای هەولێردا نیشتەجێ بوونە، ئیبن مستەوفیش هەر لەناو قەڵای هەولێردا لە بنەماڵەیەکی ڕوناکبیر و ڕۆشنبیر و دیار چاوی بەدونیا هەڵهێناوە.

---

١_ مظفر الدين: موزەفەرەدین کۆکبری کوڕی زەینەددینی عەلی لە نێو خەڵکی هەولێر ناسراوە بە سوڵتان موزەفەر (ماوەی ژیانی ١١٥٣ تا ١٢٣٢زایینی). ئەو حاکمی شاری هەولێر بووە لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەییووبی،هەروەها زاوای سەلاحەدین بووە، یەکێک لە خوشکەکانی ئەوی خواستووە بەناوی (ڕەبیعە خاتوون)لە ئێستادا لە شاری هەولێر شەقامێکی سەرەکی بەناوی سوڵتانەوەیە و پێشتریش بنکەی تەندرووستی بەنێوی ئەو هەبووە و مەزارگەیەکیشی بەناوی خۆی، بەڵام هەندێک کەس پێیان وایە مەزارگەکە گۆڕی خۆی تیا نیە بەڵکوو هی باوکییەتی.

٢_هەزبانییەکان:میرنیشینێکی کۆنی کوردستانن و لە ناوچەی هەولێر و موکریان تا ئازەربایجان لە نێوان ساڵەکانی (955_1175ز ) دەسەڵات داربوون.

باوک و مامی (ئیبن مستەوفی) کە ئیبن مستەوفی ناوی خۆی موبارەکە، پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و زانستی و کارگێڕیان هەبووە لەناوچەکەدا.

موبارەك سەرەتا لەلای مامی و باوکی دەستی بەخوێندن کردووە و زۆر پاڵپشتیشیان دەکرد تاوەکو کەسێکی هزرڤان و کاریگەر دەربچێت، دواتر باوکی پێشنیاری بۆیکرد تاوەکو لەژێر دەستی چەندین زانای تری ناوچەکەدا بخوێنێت و زیاتر پەرە بەخۆی بدات بۆئەوەی بیر و ئەندێشەی فراوانتر بێت.

ئەم زانا بەڕێزە هەر لە تەمەنی منداڵیدا باوکی دەیخاتە بەرخوێندن لەو کاتەدا قووتابخانە ئاینییەکان هەبووە بۆیە لە حوجرەی مزگەوت و قوتابخانە ئایینیەکانی ناو قەڵات دەست بەخوێندن دەکات، سەرەتا لە قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەستی پێکردووە.

دواتریش هێدی هێدی وای لێ هاتووە تاوەکو (دیوانی شاعیران و بابەتەکانی پەیوەست بە زمان و ڕەوانبێژی و ئەدەب و بەیان و زمانی عەرەبی) خوێندووە، موبارەک لەژێر دەستی زۆر لە زانایانی بەناوبانگی (هەولێر و موسڵ و شارەزوور)دا،خوێندوویەتی و توانیویەتی بەسەرکەتووی خوێندنی خۆی تەواو بکات.

ئەم زانایە تەنها لە پسپۆڕی مێژوویدا کاری نەکردووە بەڵکو لەزۆر بواری تریشدا شارەزاو لێهاتوو بووە، وەکو ) شارەزایی لە زمان و ڕێزمان و لە شیعر و ئەدەب و عیلمی بەیان و لە شیعرە عەرەبیەکان و هەروەها لە ژمێریاری)شدا، کەسێکی زۆر زیرەک و لێهاتوو بووە.

یەکێك لە گرنگترین بەرهەمەکانی کتێبی (مێژووی هەولێر/ تاریخ اربيل) بووە کە لە (4) بەرگدا نوسیویەتی.،هەندێکیش دەڵێن: (٥) بەرگ بووە.

ئیبن خەلەکان دەربارەی دەڵێ: بۆ نوسینەکانم هەموو کات پێویست بوو بگەڕابامەوە سەر ئەو کتێبەی ئیبن مستەوفی(بێگومان ئەوەش موعتەبەری و پڕ زانیاریی ئەو کتێبە دەگەیەنێت لەو سەردەمەدا).

کەسێکی نەبووە سەردانی شارەکەی کردبێ و لە لایدا نەمابێتەوە، یان بەبێ دیاریی ئەو گەڕابێتەوە. ئیبن خەلەکان دەربارەی میواندۆستیی ئەو دەفەرموێت: گەر باسی خانەدانی میواندۆستی بکرێ، راستەوخۆ ئیبن مستەوفیت بە بیردا دێت، ئەو کەسێکی رووخۆش و خاکڕەو بووە، بەتایبەت لە هەمبەر و شاعیران و زانا و فێرخوازاندا. شاعیرێکی لێهاتووش بوو، لە گفتوگۆدا زۆر پەند و قسەی نەستەقی بەکاردەهێنا. هەروەها؛ شارەزاییەکی زۆریشی هەبوو لە بواری فەلسەفە و بیرکاری و ڕێزمان و زمانی عەرەبیدا، بە بەرپرسێکی کارامە و لێهاتوو دادەنرێ لە بەڕێوەبردن و کارگێڕیدا، بەرهەمێکیشی هەبووە دەربارەی چۆنییەتی بەڕێوەبردن و هونەری ئیدارەدانی وڵات بەناوی(ابو قمش).

ئەم زانا بەڕێزە؛ خاوەنی چەندین بەرهەمی تەفسیر و لێکدانەوەی ئەدەبیات بووە بە ناوەکانی(متنبی، ابی تمام، زمخشری)، ئەمانە و چەندین بەرهەمێکی تریش.

ئیبن خەلەکان دەڵێ: کاتێ هەولێرم جێهێشت لە ساڵی ١٢٣٩ز؛ ئیبن مستەوفی سەرۆک لیژنەی دیوانی دەستەڵات بوو، ئەوەش یەکێک بوو لە پێگە بەرزەکانی دەستەڵاتداری، ئینجا دوای سێ ساڵ بوو بە

وەزیر، بەردەوام بوو لە کارەکەی؛ تا کۆچی دوایی سوڵتان موزەفەر لەساڵی ١٢٣٧ز، دواتر خەلیفە موستەنسیر دەسەڵاتی گرتە دەست و ئیبن مستەوفی لە کار دوور خستەوە و خانەنشی کرد، بەڵام لەو ماوەیەدا هەر لە شاری هەولێر دا دەژیا؛ ڕێز و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی خۆی هەر هەبوو، تا هاتنی تەتار بۆ ناوچەکە و، گەمارۆدانی شارەکە لە ساڵی ١٢٣٧ز، کە سەرەنجامێکی زۆر خراپ و دڵتەزێنی هەبوو بۆ هەولێر و دانیشتوانەکەی، ئیبن مستەوفیش یەکێک بوو لەوانەی کە بەژدار بوو لە بەرگری کردنی شارەکە، بەڵام لە کۆتاییدا دەستی بەسەر داگیرا و ئیبن مستەوفیش مەنفی کرا بۆ شاری موسڵ، هەر لەوێش؛ لە ساڵی(١٢٣٩ز/٦٣٧ک) کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی(السابلة یان سابیلاح) نێژرا.

شەمسەدینی ئەبو یوسفی شاعیر؛ لە کۆچی دوایی ئیبن مستەوفی هۆنراوەیەکی بۆ هۆنییەوە، کە دەڵێ:

ئای ئەبو موبارەک،من مردنم نەدەناسی

جا تۆ وا بەنرخی سەردەم؛ بێهاوتا بووی

ئەوەندە مەزن بووی کە، مردن توانای نەبوو لێیدا

یەکێک لە گەورەترین بەدبەختی لە میللەتانی ئیسلامدا

لە دەستدانی بوو،کەهەردوو مرۆڤ و فریشتە بۆی بوون لە تازیەباریدا.

## پەیکەری موبارەک، ناسراو بە(ئیبن مستەوفی)



## سەرچاوەکان:

---

١_

_https://new.zadyreman.com/detailnews.aspx?jimare=1527&babet=
بەرنامەی دۆکۆمێنتاری لەسەر ژیاننامەی ئیبن مستەوفی.

٣_ ویکیپیدیا.

٤_ https://kurdistantribune.com/poems-by-middle-ages-erbil-historian-ibn-mstawfi/

٥_ سایتی مێژووی کورد

www.historyofkurd.com

# ئیبن خەلەکان

باسەکەی ئەمجارەشمان هەر لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان و شاری "هۆلاکۆ" بەزێن دەبێت، ئەویش باسی (ئیبن خەلەکان)ە. ئەم زانا ناودارە خاوەنی چەندین کتێبی مێژوویی زانستییە، گرنگترینیان شاکارە مێژوویەکەیەتی کەبریتیە لەکتێبی (وفيات الأعيان وأبناء الزمان) کە یەکێکە لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانی مێژوو وە لەحەوت بەرگی گەورە پێکهاتووە و ماوەی حەوت ساڵان خەریکی ئامادە کردن و نووسینی بووە، نوسخەی دەست نووسی ئەم کتێبە بە خەتی دانەرەکەی لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراوە،هەروەها لە ئەڵمانیاش بۆ یەکەم جار بەزمانی عەرەبی لە چاپ دراوە و پاشان وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و فارسی [1].

## ئیبن خەلەکان کێیە؟

ناوی(ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی ئەربیلی شافعی)یە، لەدێی خەلەکانی سەر بە شاری هەولێر لەساڵی (٦٠٨ک/١٢١١ز) لە ئامێزی قەڵای هەولێر لەدایک بووە[2]، لە خێزانێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار و دینداردا پەروەردە بووە و پێگەیشتووە، زۆربەی ژیانی لە وەرگرتنی زانست و وانە وتنەوە و هاتوچۆ لەنێوان (شام و میسر)دا، بەسەر بردووە، لەساڵی (٦٥٨ک) واتا لەتەمەنی ٥٠ ساڵیدا، لەلایەن دەسەڵاتدارانی موسڵمانی ئەو

١ _ کتێبی: ٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی،ن:سەربەست جەباری،ل:٢٦٩-٢٧٠

٢ _ هەمان سەرچاوە.

کاتەوە کرا بە گەورە قازی و دادوەری ئەوکاتی دەوڵەت و نازناوی(قاضيا لقضاة)ی،پێدراوەلەساڵی (٦٦٩) کۆچی و لە تەمەنی ٦١ساڵیدا، وازی لەم وەزیفە و پۆستە هێناوەو گەڕاوەتەوە بۆ شاری قاهیرە و لە قوتابخانەی (فخریە) سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە، دواجار گەڕاوەتەوە بۆ شام و سەرقاڵی زانست بووە تاوەکو لەساڵی )٦٨١ک/١٢٨٢ز) لە شاری دیمەشق لەتەمەنی ٧٢ ساڵیدا کۆچی دوای کردووە.

## ڕەچەڵەکی ئیبن خەلەکان

ئیبن خەلەکان بە نەتەوە کورد و بە هۆز(خەلەکان)ی بووە، کە هۆزێکە لە هۆزە کوردییەکانی شاری هەولێری باشووری کوردستان، هەندێک لە توێژەران ڕەچەڵەکەکەی دەگەڕێننەوە پاڵ بەرمەکییەکان هەندێکیتر لە مێژوونووسانیش وەک سەفەدی و شاکر کەتبی و کۆمەڵێکی تر دەڵێن لە کوردانی هەکارییە. سەرباری ئەم ناکۆکییانەش کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی نازناوی ناوبراو دەگەڕێتەوە بۆ باپیری سێیەمی کە خەلەکانە و بە قسەی عەبدولڕەحیمی ئەسنەویش(٧٧٢ ک/١٣٧٠ز) خەلەکان ناوی گوندێکی دەوروبەری هەولێر بووە، هەر لەبارەی ڕەچەڵەک و بنەچەی ئیبن خەلەکان، ئیبن مستەوفی لە کتێبەکەیدا(مێژووی هەولێر - تأريخ الاربيل) هیچ ئاماژەیەکی بەم ئیبن خەلەکانە نەکردووە، بەڵام لەوێدا باس لە زانایەکی تر دەکا بەناوی عومەر خەلەکانی(عمر بن خلكان)؛ گوایە زانایەکی ئایینی بووە و دۆستێکی نزیکی سوڵتان موزەفەرەدینی هەولێر بووە و زۆر متمانەی پێ

هەبووە، ئەم زانیارییە لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا سەبارەت بە باوکی ئیبن خەلەکان ئەم بابەتە یەکدەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی کە باوکی ئیبن خەلەکان خۆی مامۆستا بووە لە هەولێر و کەسایەتییەکی ئایینی بووە و متمانەپێکراوی سوڵتان موزەفەرەدین بووە، لە سەرچاوەکاندا تەنها ساڵێک جیاوازی لە نێوان کۆچی دواییاندا هەیە و جیاوازیەکی کەم لە نێوان ناوەکەیاندا بەدی دەکرێت، واتە بە ڕوونی بۆمان دەرکەوت کە باوکی ئیبن خەلەکان هەولێری بووە[1].

## قۆناغی زانست و پێگەیشتنی

سەرەتای خوێندنی لە هەولێرەوە دەستپێکردووە، بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی؛ سەرەتا چووەتە حەلەب و پاشان دیمەشق، پاشان چووەتە میسر لە قاهیرە خەریک بووە بە وەرگرتنی زانیاری فەلسەفی و یاسایی و ئایینی و زمانەوانی، دوای وەک نووسەرێکی مێژوویی(مؤرخ) ناوی دەرکرد، هەروەها قوتابی "ئیبن شەداد"یش، بووە.

پێش مردنی باوکی؛ لە تەمەنی دوو بۆ سێ ساڵییەوە باوکی هەوڵی فێرکردنی داوە؛ دواییش بۆ خوێندن و پێگەیاندنی ئیبن خەلەکان دەنێرێت بۆ لای خاتوونێک بە ناوی زەینەب.

---

_ew.zadyreman.com/detailnews.aspx?jimare=1520&babet=52

# باوکی ئیبن خەلەکان

ناوی شەهابەدین محەمەدە؛ کەسێکی شەرعزان بووە، سەردەمێک لە قوتابخانەی نیزامییەی بەغدا وەک موعید کاریکردووە، دواتر چووەتە موسڵ و چواردە ساڵ لەو شارە ماوەتەوە، پاشان هاتۆتە هەولێر و بووەتە جێگە متمانەی سوڵتان موزەفەرەدین کەوکەبەری فەرمانڕەوای شارەکە، ئیبن خەلەکان لە تەمەنی لاویدا لە نێوان هەولێر و موسڵدا بەردەوامی بە خوێندن داوە، دواتر لەگەڵ براکەیدا ڕوودەکاتە شاری حەڕان و پاشان حەلەب -کە ئەوکات یەکێک لە کوڕەکانی سەلاحەدینی ئەیووبی حوکمی دەکات-. ئیبن خەلەکان و براکەی؛ لەگەڵ خۆیاندا نامەیەکی سوڵتان موزەفەرەدینی حوکمڕانی هەولێر دەبەن و دەیدەن بە قازی بەهادین، کە وەزیری کوڕەکەی سەلاحەدین بووە. لە نامەکەدا سوڵتان موزەفەرەدین دەڵێ: چی پێویستە و بە باشی دەزانیت لەگەڵ ئەم کوڕانەدا بیکە، ئەوانە کوڕی کەسێکن کە وەک برا وابووە بۆ من و وەک براش بووە بۆ تۆ. پێویست ناکات هیچ شتێک لەوە زیاتر پێشنیار بکەم. ئەو قازییە وەک وەفایەک بۆ هاوڕێیەتی لەگەڵ باوکیاندا، هەتاوەکو مردنی؛ ئەوو براکەی لە نزیک خۆی لە حەلەب دانابوو. لەوێ سەرەتا لە لای مامۆستایەک دەخوێنێت بە ناوی شێخ جەمال ماهانی -کە کوردێکی هەولێری و هاوڕێی باوکی بووە-. بەڵام بەرلەوەی بارگەی بگوازێتەوە بۆ موسڵ و حەلەب، ئیبن خەلەکان لە هەولێر لەسەر دەستی باوکی شەرعزانیی خوێندووە، لەسەر دەستی ئین شەدادی مێژوونوسی تایبەتی سەلاحەدینی ئەیوبی ئاشنای ڕێزمانی عەرەبی بووە، جگە لەم دوانەش بەرلەوەی گەشتی

حەلەب و دیمەشق بکات، شێخ شەرەفەدین ئەحمەدی کوڕی موسا بکوڕی مەنعەی هەولێری و کۆمەڵێکی تر زانا وانەیان بە ئیبن خەلەکان وتووەتەوە، لە حەلەبیش درێژەی بەخوێندن داوە و بەردەوام بووە لە کۆکردنەوەی زانست، لەوێش لای چەندین زانای گەورەی تر خوێندوویەتی، هەر لەوێش چاوی دەکەوێ بە زانا و مێژوونووسی کورد ئیبن ئەسیر و ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا دەکات، لەبەر ئەوەی کە دۆستێکی نزیکی باوکی بووە، پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵدا دروست دەکات و زۆر شتیشی لێوە فێردەبێت، لەگەل ئەمانەشدا شارەزاییەکی زۆر باشی لە شەرعزانی(فقه)و ئوسووڵ و زمانی عەرەبیدا هەبووە و، تا ڕادەیەکی بەرچاو شارەزای مەزهەبی شافیعی بووە و، لە فەتواکانیدا دیار بووە کە بەردەوام سەیری ئەو مەزهەبەی کردووە. ئیبن خەلەکان هاوڕێی کتێب بووە و پارە و ماڵەکەی هەموو داوە بە کتێب. لە سەرەتای ژیانیدا حەزی کردووە ببێت بە شاعیر، بۆیە شیعرێکی زۆری داناوە.

## ژیانی وەزیفی ئیبن خەلەکان

لە سەرەتادا ڕوودەکاتە میسر، لەوێ ماوەیەک دەستبەکار دەبێت لە پۆستی یاریدەدەری قازی گشتی میسر (قازی ئەوکاتی میسر کەسێکی کوردبوو بەناوی بەدرەدین سنجاری)، لەو پۆستە بەردەوام دەبێت هەتاکو ساڵی ١٢٦١ ز، پاشان ڕوودەکاتە شام لە دیمەشق نیشتەجێ دەبێت، هەر لەوێش دەبێتە داوەری گشتی هەموو ناوچەکانی سووریا، تا هەشت ساڵ لەو پۆستە بەردەوام دەبێت، بەڵام دواتر بەهۆی بڕیارێک(بڕیارەکە سیاسی بوو لەلایەن سوڵتان زاهیر،

سوڵتانی ئەوکاتی دیمەشقەوە دەرچوو، دەبێ ژمارەی قازییەکان زیادبکرێت لەبری یەک قازی پێویستە چوار قازی دابنرێ)، ئیبن خەلەکانیش وازهێنانی پێ باشتر بوو لەوەی ناکۆکی و راجوێیی بکەوێتە نێوان قازییەکان لە کاتی هەر بڕیارێک دەیانەوێ بیدەن، ئەمەش وردبینی و دووربینی ئیبن خەلەکان دەردەخا، بۆیە لە ساڵی ١٢٦٩ز لە پۆستەکەی لادەبرێت، یان وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر بڕیارەکە؛ خۆی واز لە پۆستەکەی دێنێت و دیمەشق جێدێڵێت، لەدوای جێهێشتنی شاعیرێکی سووری -بەداخەوە ناوەکەی ونە- شیعرێک بۆ لەدەستدانی ئیبن خەلەکان دەنوسێ و دەڵێت:

"پیاوانی دیمەشق سەرسام بوون

بە زیادبوونی ژمارەی سەرکردەی یاسایی

پیاوانی یاسا وەک ڕۆژن، سەرچاوەن بۆ ڕۆشنایی

بەڵام بۆ لە زۆربوونیاندا ئاشکرایە بە ڕوونی

لەبری زیادبوونی ڕۆشنی، وا زیادبوو تاریکایی".

لە دوایی ئەوەی دیمەشق جێدێڵێت، بەرەو میسر دەگەڕێتەوە، لەوێش دەستدەکات بە وانەگوتنەوە لە خوێندنگەی (الفخرية) لە قاهیرە، وە لە کۆتایی ساڵی ١٢٧٦ز دا دیسانەوە دەکرێتەوە بە قازی هەموو شافیعییەکانی سوریا و لە پێشوازیەکی گەورەدا بە ئامادەبوونی پاشای دیمەشق و هەموو سەرکردە سەربازی و کەسایەتییەکانی شارەکە؛ لە ساڵی ١٢٧٨ز دا دەگەڕێتەوە دیمەشق، بەڵام دیسان بەهۆی ململانێی نێوان میرەکان، ماوەیەک دەستگیر دەکرێت، پاش

ماوەیەکی کەم لێبووردنی بۆ دەردەکرێت و دیسان دەبێتەوە بە قازی گەورەی ئەو وڵاتە، پاشان دەبێتەوە قازی تا سێ ساڵ بەردەوام دەبێت لەو پۆستە، دوای ئەوە خانەنشین دەکرێت. ئیبن خەلەکان لە دوو ساڵی کۆتایی ژیانیشدا بەتەواوەتی خۆی یەکلایی کردبۆوە بۆ وانەبێژی و وازی لە دادگەری هێنابوو.

## کۆچی دوایی ئیبن خەلەکان

دوای بەسەربردنی ژیانێکی پڕ شکۆ و بەها لە وەرگرتنی زانست و خەریک بوون بە نوسین وخزمەتکردنی کۆمەڵگە و پێگەیاندنی فێرخوازان، لە(٢٦ی – ڕەجەبی – ٦٨١ک/ ٢ی – تشرینی دووەمی – ١٢٨٢ز) لە دیمەشق کۆچی یەکجاری کرد و لە چیای قاسیون لە گۆڕستانی جوعییە ئەسپەردە کرا[1].

١ _ هەمان سەرچاوەی پێشووتر.

## مێژوونووسە تایبەتەکەی صەڵاحەدین

لەبەشی یەکەمدا بەتایبەتی لە باسکردنی ژیاننامەی سوڵتان (صەڵاحەدینی ئەیوبی)دا، زۆر باسی قسە و گێڕانەوەی کەسایەتیەکمان دەکرد سەبارەت بە ژیاننامەی سوڵتان صەڵاحەدین، بەناوی "ئیبن شەداد"وەکو یەکەمین مێژوونووسی سڵاحەدین دەستی کردووە بە نوسینەوەی ژیاننامەی سوڵتان صەڵاحەدین بەناوی "النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية"، بەڵام زیاتر بە "ژیاننامەی سەلاحەدین" بەناوبانگە.

زۆرێک لە توێژەران و مێژوونوسان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو ژیاننامەی ئیبن شەداد، بۆ سەلاحەدین ئەیوبی نوسیوەتەوە، گرنگترین بەرهەمە لەسەر ئەم پاڵەوانە مێژوییەی دنیای ئیسلام. زۆربەی ئەوانەی لەبارەی ناوبراوەوە توێژینەوەیان کردووە، ناچار گەڕاونەتەوە سەر ئەم بەرهەمە، چونکە هاوچەرخ بە سەردەمی سەلاحەدین نوسراوەتەوە و زۆرێك لە وردەکارییەکانی شەڕی خاچپەرستانی تێدایە، لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی قودس لەلایەن سەلاحەدینەوە. ئەم وتارە تیشك دەخاتە سەر نوسەری بەرهەمەکە و چۆنییەتی وێناکردنی پاڵەوانەکەی کە سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبییە کە زۆرجار بە "شێری دوو کیشوەر" ناوی دەهێنرێت کە ئاسیا و باکووری ئەفەریقایە، بۆیە پێم خۆشبوو ناساندنێک بۆ ئەم کەسایەتییە بکەم لە بەشی دووەمی کتێبەکەمدا و بەکورتی تیشکێک بخەمە سەر ژیاننامەی، تاوەکو ئێوەش ئەم زانا بەڕێزە بناسن کە هاوڕێ و ڕاوێژکاری سوڵتان سڵاحەدینی ئەیوبی بووە، هەروەها ئەم کەسایەتییە لە بنەڕەتدا کەسێکی کوردە.

لەمیانەی خوێندنەوەی مێژووی سەردەمی سەلاحەدیندا دەردەکەوێت کە ئیبن شەداد یەکێك لە سێ گرنگترین کەسایەتییەکانی بواری ئەدەب و زانست و سیاسەت بووە لەناو دەوڵەتی ئەیوبی لە پەنای قازی فازل و عیماد کاتبدا و لە بنەڕەتیشەوە لێهاتوویی خۆی ئیبن شەدادی بە سەلاحەدین ناساندووە.

## ئیبن شەداد کێیە؟

ناوی تەواوی "بەهائەدین یوسف کوڕی ڕافع کوڕی تەمیمە" لە بنەماڵەی کوردانی (بەنی شەدادە (لەساڵی (539 ک / 1145ز) لە شاری موسڵ لەدایک بووە،مێژوونووس و زانا و شەرعزان و قازی قازیەکان بوو، هەروەها مامۆستای مێژوونووسی بەناوبانگ ئیبن خەلەکانە.

ئیبن شەداد بە هەتیوی گەورە بووە، چونکە هەر بە منالی باوکی لەدەستداوە، لەبەرئەمەش لە ئامێزی ماڵی خاڵەکانی پەروەردە بووە و شەدادیش نازناوی باوانی دایکییەتی ناوبراو هەر لە موسڵ قورئان و فەرموودە و کتێبە سەرەتاییەکانی خوێندووە لەسەر دابونەریتی سەردەمی خۆی[1].

هەروەکو ئاماژەمان پێکرد ئیبن شەداد لەشاری موسڵ لە دایک بووە، لەو شارە خوێندی و لە فیقهدا شارەزایەتیەکی تەواوی دەسکەوت، پاشان چۆتە بەغدا و لە قوتابخانەی (النظامية) زانستی عەقڵی و وێژەیی خوێندوە، دوای چوار ساڵ لە ساڵی (569ک)دا

---

١_https://xalkurd.org/details.aspx?kodtech=291.

گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ، ئەو کاتەی تەمەنی 30 ساڵ بووە لە موسڵ لە قوتابخانەی (الشهرزورية) دەرسی گوتووەتەوە، لەوێ پلە و پایەی بەرزبووەتەوە.

خاوەن ئاوەز بووە و خاوەن هزرێکی سنگسن بووە، لەبەرئەوە ئەتابەک[2] .

چەندین جار بەباڵیۆز ناردوویەتی بۆلای خەلیفەی عەباسی ولای سڵاحەدین دوای ئەوەی لە ساڵی(583ک/1188ز) لە حەج گەڕایەوە سەردانی (بيت المقدس)ی کرد، کە تازە سوپای موسڵمانان فەتحیان کردبوو، لەوێ سەلاحەدین بەدوای ناردوو و داوای لێ کرد کە لەلای بمێنێتەوە، ئیبن شەداد ڕەزامەندی دەربڕی و لەلای سەلاحەدین مایەوە ، لەوێوە دەبێتە مێژوونووسی تایبەتی سەلاحەدین و دەست دەکات بە نووسینی کتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية/سيرة صلاح الدين الأيوبى)، لەم کتێبەدا هەر چییەکی دیتبێت و بیستبێتی، بە شێوازێکی شیرین بەبێ جوانکاری زمانەوانی تۆماری کردووە،خەباتی سەختی سوپاکەی سەڵاحەدین دژ بەهێرشی سێ یەمی خاچپەرستان بەشێوەیەکی تەواو نمایشی کـردووە بە بێ ئەوەی بەدوای هەوا و هەواس پەرستی قارەمانیەتی پەلکێش

---

٢_ ئەتابەگ، وشەیەکی تورکییە لە دوو بڕگە پێکهاتووە: (ئەتا-باوک)، (بەگ-میر)، بە واتای باوکی میر دێت؛ لە بنەڕەتدا بەو کەسە دەگوترا کە پەروەردەکردنی منداڵی سوڵتانەکانیدەکەوێتە ئەستۆی، پاشان میری دەوڵەتەکان و فەرمانڕەوایانی کوردستان ئەم نازناوەیان هەڵگرتووە کە بریتی بوون لە پێنج چین: میرەکانی فەرمانڕەوای ئەرتەقی، فەرمانڕەواکانی شای ئەرمەنە، سوڵتانەکانی فەرمانڕەوایی زەنگی، ئەتابەگییەکانی ئازەربایجان، ئەتابەگی لوڕستان و هەولێر نازناوی ئەتابەگ یەکەم جار بە نیزامەئەلمولکی تووسی وەزیری مەلەکشای سەلجووقییەکان درا.

ببێ، هەر بۆیە دەگمەنە سەرچاوەیەکی مێژووی سوڵتانێ یان میرێ لە سەرکردەکانی چاخی ناوەڕاست بدۆزرێتەوە هێندەی کتێبەکەی ئیبن شەداد بایەخی مێژووی هەبێت[1].

ئیبن شەداد ساڵانی کۆتایی سەلاحەدین ماوەیەک وەك ڕاوێژکار و ماوەیەکی تر وەك نهێنی پارێز، هەندێک جاریش وەك بەرپرسێکی باڵای دەوڵەتی ئەیوبی کاری کردووە و چەند کاتێکی کەم نەبێت هەرگیز لە سەلاحەدین جیانەوبۆتەوە، هەر بەم هۆیەشەوە ناوبراو لەگەڵ قازی فازڵدا تاکە کەس بوون کە لەکاتی سەرەمەرگ لە پشتی سەرییەوە بوون لە شاری دیمەشقی پایتەختی شام(11)، هەر ئەم پەیوەندی و متمانەیەش دەرفەتی زۆری بۆ ڕەخساندووە کە لە نزیکەوە ئاگاداری زۆربەی هەرە زۆری نهێنییەکان و چۆنییەتی دروستکردنی بڕیار ببێت لەناو دەوڵەتی ئەیوبی لە سەردەمی سەلاحەدین و تەنانەت پاش کۆچی دوایی ئەویش لە سەردەمی کوڕەکانی.

---

١ _ ویکیپیدیا.

## بەرهەمەکەی ئیبن شەداد " النوادر السلطانية"

تەواوی ئەم کتێبە بریتییە لە " النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية"، بەڵام زیاتر بە "ژیاننامەی سەلاحەدین" بەناوبانگە. ئیبن شەداد ئەم کتێبەی وەك یاداشتی ڕۆژانە نووسیوەتەوە و دابەشی کردووە بۆ دوو بەشی سەرەکی: یەکەمیانی تایبەت کردووە بە لەدایکبوونی سەلاحەدین، گەشەکردن و پێگەشتنی، ئاکار و ڕەوێ و ڕەفتاری. بەشی دووەمیش تەرخانە بۆ بارودۆخی سەردەمی سەلاحەدین، جەنگەکان و مێژووەکان و بەروارەکانیان تا کۆتایی ژیانی. لە کۆتاییشدا ئامارێکی خستۆتەڕوو لەبارەی ئەو قەڵا و شارانەی لە سەردەمی سەلاحەدین کۆنترۆڵکراون بەدرێژایی مێژووی تێکۆشانی ئەو لە نێوان ساڵانی 583 - 586 ك/ 1187 _ 1190 زاینی. لەبارەی میتۆدی ئەم بەرهەمەوە، ئیبن شەداد ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو دروست لە مانگی جەمادی یەکەمی 584 ك/ 1188ز چۆتە ناو ئیدارەی سەلاحەدینەوە، بۆ بەسەرهات و ڕووداوەکانی پێش ئەو بەروارەش پشتی بە خەڵکانی متمانەپێکراو بەستووە. پاش ئەو ساڵەش شتەکانی چۆن دیوە وەها تۆماری کردوون، یان چۆن خەڵکانی متمانەپێکراو بۆیان گێڕاوەتەوە(12). لەم میانەیەشدا کاتێك ڕوداوەکانی ساڵی 585ک _ 1189ز دەگێڕێتەوە باس لەوە دەکات ئەو لەوێ نەبووە و لە سەفەر بووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆئەوەی بەرهەمەکەی گێڕانەوەی ڕاستەخۆیە، ئەمەش بۆ مێژوونوسان بایەخێکی هێجگار گرنگی هەیە[1].

---

١_ https://xalkurd.org/details.aspx?kodtech=291

## شێوازی نووسینی کتێبەکەی

ئیبن شەداد، ڕوداوەکان بە زنجیرە دەگێڕێتەوە بەپێی ڕیزبەندی مانگ و ساڵەکان، بەڵام بەرهەمەکە ساڵنامە نییە وەك ئەوانەی تەبەری و ئیبن ئەسیر، بەڵکو ناونیشانی سەرەکی داناوە بۆ ڕووداوەکان بە ڕەچاوکردنی کاتی ڕوودانیان، زمانی بەرهەمەکەش ئاسانە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ بەرهەمە مێژووییەکانی تری سەردەمی پێش سەردەمی ئەیوبی.

ئیبن شەداد زۆر دەستەواژەکانی ”دیم“، ”چاوم پێی کەوت“، ”گوێم لێبوو“ ئەمەش نیشانەی ئامادەییەتی لەناو ڕووداوەکان و بەشداریکردنییەتی لە دروستکردنی هەندێکیان بە حوکمی نزیکایەتی لە سەلاحەدین.

دەستنوسی بەرهەمەکەی ئیبن شەداد لە کتێبخانەی قودس پارێزراوە، بەپێی لێکۆڵەری ئەو نوسخەیەش کە جەمالەدین شەیالە و لە 1959 ئەنجامیداوە، نوسخەکە شەش ساڵ بەر لە مەرگی ئیبن شەداد نوسراوەتەوە و پیشانی خۆی دراوە و لەسەری ڕازی بووە، ئەمەش نزیکی دەکاتەوە لە وێنەی کتومت.

بەرهەمەکەی ئیبن شەداد وەسفێکی وردی تیایە لەبارەی ڕووداوە مێژووییەکان، لەبارەی جەنگەکانی نێوان ئەیوبی و خاچپەرستەکان، وەسفکردنی ئامرازە جەنگییەکان. لە بەرهەمەکەی ئیبن شەدادا وەسفی هەندێك ئامرازی جەنگی هاتوون لە سەرچاوەکانی تردا نین. جگە لە باس و خواستی جەنگەکانیش، ئیبن شەداد درێغیی نەکردووە لە ڕونکردنەوەی دۆخی کۆمەڵایەتیی و ئیداری کۆمەڵگا ئیسلامیی و

مەسیحییەکانی ئەوکات بەتایبەت لە بواری ناوبژیوانی و نێوانگریی لە جەنگەکان.

لە بەرهەمەکەیدا [سيرة صلاح الدين] ئیبن شەدداد باسی چۆنییەتی دانیشتنی سەلاحەدینی کردووە بۆ چارەسەری کێشەکان، چۆنییەتی پەنابردنی مسوڵمانەکان بۆ دادوەرێکی مسوڵمان کاتێك لە ژێردەستی خاچپەرستەکان بوون. بەپێی گێڕانەوەکانی ئیبن شەدداد میرە خاچپەرستەکان شتێك لە زمانی عەرەبی و مێژوو دابونەریتیان زانیوە.

ئیبن شەدداد باس لەوە دەکات تۆڵەی خەتابار لای سەربازانی ئەڵمان کوشتن بووە و دەڵێت "هەرکام لەوان تاوانێکیان بکردایە هیچ چارێکی تری نەبوو جگە لە سەربڕین وەك مەڕ" لەمیانەی خوێندنەوەی بەرهەمەکەشدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئیبن شەدداد لەژێر کاریگەریی کەسایەتی سەلاحەدیندا بووە، هەرگیز ناوی نابات لەگەڵ دەستەواژە و نازناوی گەورەییدا نەبێت، پاسا و بۆ هەموو هەنگاوەکانی دەهێنێتەوە بە بەڵگە و شیکاری جیا جیا، بەڵام ئەمە ڕێگر نەبووە ڕووداوەکان بە دروستی تۆمار بکات، بۆ نمونە لە باسی سەرکەوتنی سەلاحەدیندا لە شاری میافارقین، ئەوەی خستۆتە ڕوو "فەرمانڕەوای شار درێغیی نەکردووە لە بەرگریی، بەڵام قەدەر بەخشیبووی بە سەلاحەدین". سەرسامی بە سەلاحەدین پەسەندکردنی زۆری لەلایەن ئیبن شەدادەوە شتێکی سەیر نییە ئەگەر ئەوە بزانرێت کە ناوبراو چەندە نزیك بووە لەم سەرکردەیە و چۆن بەشداریی بڕیار و هەنگاوەکانی کردووە.سەرسامی ئیبن شەدداد بە سەلاحەدین لە دەستپێکی بەرهەمەکەیدا دەردەکەوێت کە لەبارەی سەلاحەدینەوە کۆمەڵێک نازناوی هۆندۆتەوە لەوانەش "الملك

الناصر، جامع كلمة الأيمان، قامع عبدة الصلبان، رافع علم العدل والأحسان، صلاح الدنيا والدين، سلطان الإسلام والمسلمين، منقذ بيت المقدس من أيدي المشركين، خادم الحرمين الشريفين ". لە میانەی خوێندنەوەی بەرهەمەکەی ئیبن شەدادا دەردەکەوێت کە ناوبراو تۆماری ڕۆژانەی کردووە، چونکە لەکاتی ناوبردنی سەلاحەدیندا زوو زوو دەڵێت "يرحمه الله" لەکاتێکدا پێداچونەوەی بەرهەمەکە لەلایەن خۆیەوە کەوتۆتە پاش وەفاتی سەلاحەدین.

## کۆچی دوایی ئیبن شەداد

ئیبن شەداد دوایی مردنی سەلاحەدین، هەوڵی دا ڕێگری بکات لە سەرهەڵدانی ئاژاوە لە نێوان کوڕەکانی سەڵاحەدین دا، دواتر گەڕایەوە میسر و هەوڵیدا مەلیک عەزیز عوسمانی کوڕی سەلاحەدین لە جێی بابی دانێت و لەو کارە گرینگە سەرکەوتوو بوو ، لە ساڵی (591ک) مەلیک زاهیر غیاسەدین میری حەلەب، داوای لێکرد بچێت بۆ ئەوێ و دادوەری حەلەب لەدەست بگرێت، ئیبن شەداد ئەو داخوازیەی بەجێ هێنا و تا دوا کاتەکانی ژیانی (632ک/1234ز) لەو کارەدا مایەوە و لەتەمەنی (٩٣) ساڵیدا لە حەلەب گیانی سپارد.



# ئیبن تەیمییە

هەرچەندە باسی ئەم زانا بەڕێزە بکەین ناتوانین حەق و مافی تەواوەتی وەکو خۆی پێبدەین، ئەم زانایە لە بنەڕەتدا کوردە و خەڵکی باکووری کوردستانە،بەڵام عەرەب زۆر هەوڵی داوە بیکاتە موڵکی خۆی، تاوەکو فەخر و شانازی پێوە بکات.

ئیبن تەیمییە زانا و موفتی و شارەزا لە زانستی شەرعی و فیقهی ئیسلامی و تەفسیری قورئان و فەرموودەدا بووە کە بە (شيخ الإسلام)یش، ناسراوە.ئیبن تەیمییە لە خێزانێکی زانست پەروەر بووەو پێگەیووە و سەرجەم زانستەکان بەباشی فێربووە و پێش تەمەنی (٢٠)ساڵی و هەر بەگەنجی توانای فەتوا دانی هەبووە[1]،وە بەکەسێکی گەڕانەوە بۆ یەکتاپەرستی و لەناوبەری بیدعەچی بەناوبانگ و ناسراو بوو.ئیبن تەیمییە کەسێکی پارێزگارو موجاهید و زاهید بووە و چاونەترس و ئازا بووە، بەهیچ شێوەیەک ماستاو و ڕوپامایی بۆکەس نەکردووە، بە کەسێکی نوێکەرەوە(مجدد)ی، سەردەمی خۆی ناسراوە، ماوەیەک چووە بۆ میسر بۆ فەتوادان و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شام لەزیندان و لە ساڵی (٧٢٨ک/١٣٢٨ز) کۆچی دوایی کردووە، خەڵکی هەموو شاری دیمەشق شوێن جەنازەکەی کەوتن کە ژمارەیان (٢٠٠)هەزار کەس بووە، وتراوە: جەنازەکەی ئەم گەورەترین جەنازەبووە لە ئیسلامدا لەدوای جەنازەکەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل[2].

---

١_ ٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی، ن: سەربەست جەباری، ل: ٢٧١

٢ _ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەم زانا ناودارە یەکێکە لەو زانا ناودارانەی کە زۆرترین نوسراویان هەیە کە نوسراوەکانی نزیکەی (٣٠٠) بەرگ بوون، ناودارترینیان بریتییە لە (مجموعة الفتاوى) کە (٣٧) بەرگە.

## شاری حەڕان

لەناوچەیەکی کوردستانی ئازیز شارێك هەبوو پێی دەوترا حەران، ئەم شارە کاتی زوو نشینگەی پێغەمبەری خوا ئیبراهیم پێغەمبەر بووە، بەڵام دواتر کەسانی بێباوەڕ تیایدا دەرکەوتن کەپێیان دەوترا صابیئیەکان، ئەمانە لەبری خوای گەورە ئەستێرەیان دەپەرست.

کاتێك ئایینی ئیسلام هات لەسەردەمی خەلیفەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتابدا لەلایەن موسوڵمانانەوە شاری حەران ئازاد کرا، ئیتر ئاینی خوا گەیشتە ئەو شارەو ریشەی بتپەرستی تیایدا وشك بوو.

لەناو ئەم شارە کوردیەدا بنەماڵەیەکی گەورەو خواناس دەرکەوت کەزۆربەی هەرە زۆری کەسەکانی زانای گەورە و هەڵکەوتەی ناو موسوڵمانان بوون،ئەو بنەماڵەیە بنەماڵەی تەیمیە بوو، ئەوانە دەیان زانای گەورەیان پێشکەش کرد بەموسوڵمانانو تا ئەمڕۆش موسوڵمانان قەرزاری زانست و خزمەتی ئەوانن.

لەو شارەداو لەناو ئەو بنەماڵەدا زانایەکی گەورە هەبوو کەناوی عەبدولحەلیم بوو، ئەو زانایە هەر لە منداڵیەوە لەسەر دەستی باوکی زانستی وەرگرت و پێگەیشت و دواتر کەوتە وانەوتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانستو خزمەت کردن بەموسوڵمانان، تا کاتی خۆی هات ژنێکی هێنا بەناوی ستونیعەم کە ئافرەتێکی زیرەك و زانا بووە.

خوای گەورە چەند منداڵێکی بەخشی بەم ژن وپیاوە زاناو خواناسە، هەموو منداڵەکانیشیان کەسی دیار و زانا دەرچوون کە خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش کرد ،ناوی منداڵەکانی بریتی بوون لە (عەبدورحمان، عەبدولا، ئەحمەد).

لەهەموویان زیرەکتر و زاناتریان ئەحمەد بوو کە لەبەر زۆر زیرەکیەکەی بوو بەکەسایەتی هەرە دیاری بنەماڵەکەی، هەر لەبەرئەوەش بەناوی بنەماڵەکەیەوە ناسراوەو بە (ئیبن تەیمیە) ناوی دەبرێت.

ئیبن تەیمیە لەساڵی 661 کۆچی لەشاری حەران لەدایك بوو، لەوێ سەرەتای ژیانی دەستی پێکرد، هەر لەمنداڵیەوە دایك و باوکی گرنگییەکی زۆریان پێدا تا زانستی زۆری پێببەخشن، بەڵام هێندەی نەبرد باری ژیانیان تێکچوو و ناچار بوون شارو ناوچەی خۆیان جێبهێڵن، ئەوکات هێشتا تەمەنی ئیبن تەیمیە شەش ساڵ زیاتر نەبوو.

## بۆچی ناچار بوون شارو ناوچەی خۆیان جێ بهێڵن؟

چونکە مەغۆلەکان کە خەڵکێکی دڕندەو پیاوکوژ و خراپەکار بوون هێرشیان هێنا بۆ سەر شارەکەیان، بۆیە ئەو خێزانە ناچار بوون کۆچ بکەن بۆ وڵاتی شام بۆ شاری دیمەشق، بۆئەوەی دەستگیر نەکرێن بەشەو کۆچیان کرد و هەرچی کتێبیان هەبوو بەچەند عەرەبانەیەك لەگەڵ خۆیاندا بردیان تا لەوێش لە زانست نەبڕێن.

کاتێك چوون بۆ شاری دیمەشق لەوێ باوکی لەمزگەوتدا وانەی دەوتەوەو ئیبن تەیمیەش بەردەوام زانستی وەردەگرت و لەخزمەت چەندین زانا و مامۆستادا زانستی وەردەگرت، بەوجۆرە گەورە بوو تا گەیشتە تەمەنی گەنجی.

## ئیبن تەیمییە کێیە؟

شیخ الإسلام ناوی تەواوی (ئەحمەدی کوڕی عبدالحلیم کوری عەبدولسەلامی کوڕی عبداللّٰهی کوڕی تەیمییەی حەڕانی)یە، لەساڵی (١٢٦٣ز) لەشارێک بەناو(حەڕان) کە ئەکەوێتە باکوڕی کوردستان وە نزیکە لەسنووری سوریاوە لەدایکبووە.

ئیبن تەیمیە لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستیکردوە بە خوێندنی ئایین و زمانی عەرەبی و بیرکای، هەر لە تەمەنی مێردمنداڵیدا قورئانی لەبەرکردوە. لای زیاتر لە 200 شارەزا و مامۆستای

ئیسلامی وانەی ئایینی خوێندوە و زانیاری و ئەزمونی لێوە بەدەخستون. لە تەمەنی مێردمنداڵیدا شارەزاییەکی باشی هەبووە لە بوارەکانی تەفسیر، فەرمودە، فیقە و زمانی عەرەبی دا. بە گوێرەی هەندێك سەرچاوەی ئیسلامی، جگە لە زمانی عەرەبی، ئیبن تەیمیە شارەزای زمانەکانی عیبری، لاتینی و تورکی بووە و لە نووسین و نامەکانیدا ئەو زمانانە دەرکەوتون.

ئیبن تەیمیە ئەو عالمەیە کە هەرکاتێك وترا ئیبن و تەیمییە وای فەرمووە زاناو فەرموودە ناسەکان بێدەنگ دەبن لەئاست فەتواکانیدا .

ئیبن و تەیمییە شارەزاییەکی زۆری هەبووە لە زانستەکانی

( پزیشکی و ماتماتیك و فیزیا و گەردوون ناسی و کیمیاو هەندەسە) بێجگە لە زانستی شەرعی ، ئێستاش بەشێك لە کتێبەکانی دەستی بەسەردا گیراوە لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن .

ئیبن و تەیمییە ڕۆڵێکی کاریگەر و گەورەی بینی لە ڕووبەڕووبونەوەی تەتارومەغۆلەکان بەوەی هەستا بە دەرکردنی فەتوا و هاندانی ئومەتی ئیسلام لە ڕووبەڕووبونەوەی تەتارومەغۆلەکان و هاندانی سەرکردەکانی ئیسلام وەکو ( مهنا عیسی ، محمد بن قلاوون ، المستكفي بالله ) بۆ دژ وەستانی مەغۆل و تەتار .

بەڕای زۆرێك لە زانایان ئیبن تەیمییە بە زیندوکەرەوەی دین (مجدد) دادەنرێت لە بواری عەقیدەیی و زانستی و فقهی شەرعی ... هتد .

# قۆناغی گەنجێتی ئیبن تەیمیە

شارەزاییەکەی ئیبن تەیمیە لە ئایینی ئیسلام و لق و پۆپەکانی ئەو ئایینە و وردەکارییەکانیدا، بە رادەیەك بووە کە لە تەمەنی 17 ساڵییەوە فەتوایداوە و لە بواری ئایینی ئیسلامدا نوسیویەتی و کتێبی بڵاوکردوەتەوە. لە تەمەنی 21 ساڵیدا، ئیبن تەیمیە بووەتە مامۆستای ئایینی و وانەی ئیسلامیی وتوەتەوە و بووەتە شێخ و سەرمەشقی ئەو خوێندنگە ئایینیەی کە پێشتر باوکی وانەی تیادا دەوتەوە[1]. ماوەیەك لە قوتابخانەی حەنبەلی وانەی وتوەوە. لە تەمەنی 30 ساڵیدا و لە رۆژی 10ـی سەفەری 691ـی کۆچیدا،

ئیبن تەیمیە وەك وانەبێژی تەفسیری قورئان لە مزگەوتی ئەمەوی دەستبەکاربووە و ساڵانێکی زۆر لەوێ وانەی وتوەتەوە و فێرخوازان رویان لە مزگەوت و خوێندنگەکەی کردوە و وانەی ئایینیان لە لای ئیبن تەیمیە خوێندوە.

---

[1] https://www.dabran.org/Dreje.aspx?jimare=2554&paiw_andidar=2

# ڕەچەڵەك و نەتەوەی ئیبن تەیمیە

محەمەد ئەبو زەهرە لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی "ئیبن تەیمیە" لەبارەی رەچەڵەکی ناوبراوەوە دەڵێت: "شێخی ئیسلام عەرەب نەبووە، کورد بووە، بەو بەڵگەیەی کە مێژونوسان ئاماژەیان بۆ هۆزەکەی نەکردوە." بەڵام ئیبراهیم محەمەد ئەلعەلی مێژونوسی عەرەب و شارەزای ئیسلام، بەرپەرچی ئەو بۆچونەی داوەتەوە و لە کتێبەکەیدا "شێخی ئیسلام ئەحمەد بن تەیمیە پیاوی چاکسازی و بانگخوازی" جەختیکردوەتەوە لەوەی ئیبن تەیمیە عەرەب بووە. هەروەها نورەدین مەحمود عەدەوی لە کتێبەکەیدا کە بە ناونیشانی" الزيارات" بڵاویکردوەتەوە، جەختیکردوەتەوە کە ئیبن تەیمیە لە هۆزی "بەنی نومەیر"ـە و ئەوەش نازناوی خۆی و بنەماڵەکەیەتی.

## نازناوی ئیبن تەیمیە

بەهۆی ئەو شارەزاییەی ئیبن تەیمیە لە ئایینی ئیسلامدا هەیبووە و پابەندی ڕێبازی سوننە و جەماعە بووە و زۆربەی کاتەکانی ژیانی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئایینی ئیسلام تەرخانکردوە، زۆرێك لەو شارەزا و کەسایەتییە ئایینیانەی هاوسەردەمی بوون و چەندینی تریش کە دوای ئیبن تەیمیە پەیدابوون، نازناوی "شێخی ئیسلام"یان بە ناوبراو بەخشیوە و تا ئێستاش، لە نێوەندی ئیسلامیدا ئیبن تەیمیە بە "شيخ الإسلام" دەناسرێت و ناوبانگی بڵاوبووەتەوە.

## کار و پیشەی

ئیبن تەیمیە شارەزایەکی ناوداری ئیسلامە. لە بۆچونەکانیدا پشتی بە دەقەکانی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەری ئیسلام بەستوە. ئیبن تەیمیە، رۆڵێکی کاریگەر و گەورەی هەبووە لەوەی "جیهاد" بخاتە پلەوپایەیەکەوە کە بەلای شوێنکەوتوانیەوە ببێت بە یەکێك لە کۆڵەکە و پایە سەرەکییەکانی ئیسلام. ئەوەش کاریگەرییەکی بەرچاوی خستە سەر بیرکردنەوەی ئەو ئیسلامگەرا و گروپە ئیسلامیە سیاسییانەی لە سەدەی بیستەم بەدواوە سەریانهەڵداوە و تا سەردەمی ئێستاش بەردەوامن لە پەیدابوون و جموجۆڵ و کارکردن.

## بەشێك لە کتێبەکانی ئیبن تەیمیە

ئیبن تەیمیە، خاوەنی زۆر کتێبە،"ئیبن قەیم الجوزی" کە خوێندکاری ئیبن تەیمیە بووە لە کتێبی (أسماء المؤلفات)ەکەیدا، ناوی (٣٣٧) کتێبی دەهێنێت، هەندێک جار بە هاوەڵانی دەگووت: ئەو ۆەستنووسانەم بۆ بهێننەوە یا بڵاوبینەوە، بەڵام ئەوان لەبەر داکۆکیان لەسەر نوسراوەکان لای خۆیان دەیانهێشتنەوەو نەشیان دەتوانی بڵاوی بکەنەوە، هەروەها هەندێک جار لەبەر ترس شاردراونەتەوە، هەندێکیشیان فرۆشراون وە بەشێکیشیان فەوتاون[1].

---

١ _ کتێبی: وتە و ئامۆژگاری و ژیاننامەی ئیبن تەیمییە، ل: ٤٠

لێرەدا ناونیشانی چەند كتێبێكی دەخەینەڕوو:-

- ڕێبازی سوننەتی پێغمبەر.
- كۆی فەتواكان.
- الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان.
- ڕەتدانەوەی لۆژیككخوازان.
- وەڵامی ڕاست بۆ ئەوانەی ئایینی مەسیحیان گۆڕی.
- حوكمی جنێودان بە هاوەڵان.
- كۆمەڵەی یەكتاپەرستی.
- پەیامی مەدەنی.
- باوەڕ.
- لۆژیك.
- العبودية.
- أمثال القرآن.
- أقسام القرآن.

ئەمانە ناوی بەشێک لە کتێبەکانی "ئیبن تەیمییە" بوون[1].

---

١ _ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠

لەگەڵ//

https://www.dabran.org/Dreje.aspx?jimare=2554&paiwandidar=2

# فێربوون و پێگەشتنی

ڕۆژێك عەبدولحەلیم منداڵەکانی کۆکردەوە تابیانبات بۆ سەیران و گەڕان، بەڵام ئیبن تەیمیە داوای کرد لەباوکی ڕێی بدات نەچێت بۆ سەیرانەکە، باوکیشی ڕازی بوو، تا باوکی و براکانی چوون بۆ گەڕانەکەیان و هاتنەوە ئیبن تەیمیە کتێبێکی گرنگ و گەورەی زانایەکی لەبەرکردبوو، کەباوکی هاتەوەو ئەوەی بینی تەواو سەرسام بوو بەتوانای کوڕەکەی، بۆیە ترسا خەڵکی زیانی پێبگەیەنن، بە ئیبن تەیمیەی کوڕی وت ڕۆڵە شیرینەکەم ئەمە بۆ کەس باس نەکەیت.

جارێك زانایەکی حەلەبی هاتە دیمەشق و بیستبووی ئیبن تەیمیە زیرەکە، بۆیە چوو بۆلای تا تاقی بکاتەوە، کاتێك پرسیاری لێکرد و ئیبن تەیمیە وەڵامی دایەوە هێندە زیرەکانەو بەهێز وەڵامی دایەوە کەزاناکە تەواو پێی سەرسام بوو، زاناکە یەکسەر وتی ئەگەر ئەم کوڕە بمێنێت لە داهاتوودا ڕۆڵی زۆر گەورەی دەبێت.

ئیتر هێندە زیرەك بوو تاخێرا بوو بەزانایەکی دیارو لەتەمەنی حەڤدەساڵیدا فەتوای دەدا لەسەر مەسەلەکان، فەتواکانیشی ڕاست بوون و زانایان ڕەخنەیان لێ نەدەگرت.

ئیبن تەیمیە هیچ کات پارەو شتی لەخەڵك وەرنەدەگرت چونکە هەر لەمنداڵییەوە بەڵێنی دابوو بەخوای گەورە کە لەسەر قورئان پاداشت وەرنەگرێت، بۆیە کاتێك قورئانی لەبەردەکرد و کەسێك بیویستایە

خەڵاتی بکات وەری نەدەگرت، چونکە دەیوت من تەنیا لای خوا پاداشت وەردەگرم.

هیچ کات ئیبن تەیمیە رەخنەی نەدەگرت لەخواردن، بەڵکو بەهەر خواردنێکی حەڵال رازی بوو و نارەزاییشی دەرنەدەبڕی.

لەساڵی 692 کۆچیدا واتە تەمەنی 31 ساڵی ئیبن تەیمیە لەگەڵ کاروانێکدا چوو بۆ حەج، لەرێگەی سەفەریاندا رەشەبایەکی توند هەڵیکرد کەژمارەیەکی زۆری خەڵکەکە بەو هۆیەوە مردن، بەڵام ئیبن تەیمیەو ژمارەیەکی تر لەخەڵکەکە رزگاریان بوو.

دوای ئەوەی باوکی کۆچی دوایی کرد ئیبن تەیمیە لەشوێنی باوکیدا لەمزگەوتدا وانەی دەوتەوە، هێندە زیرەك بوو کەکاغەزو نووسینی لەبەردەستیدا نەبوو و هەموو شتەکانی لەبەر بوو، ئیبن تەیمیە لەوتارەکانیدا زۆر گرنگی دەدا بە فەرموودە و لەرێبازی راستی زانایانی پێشوو لای نەدەدا، دوای وتارەکەش گوێی دەگرت لە پرسیاری خەڵك و وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە.

جارێك ئیبن تەیمیە نەخۆش کەوت، کاتێك چوو بۆ لای پزیشك پزیشکەکە پێی وت زۆر مەخوێنەرەوەو خۆت ماندوو مەکە، لە وەڵامدا ئیبن تەیمیە وتی مەگەر ئێوە ناڵێن ئەگەر کەسێك حەزەکەی بێتەدیو خۆشی بێت ئەوە بۆ تەندروستی باشە، دەی من لەکاتی خوێندنەوەو زانستدا تەواو خۆشیمە و دەبێت باش بێت بۆم، بۆیە هۆکاری نەخۆشیەکەی من ئەوە نیە.

ئیبن تەیمیە لەبەرگریکردنی لە موسوڵمانان زۆر دلێر و نەترس بوو، کاتێك مەغۆلەکان هاتن و شامیان داگیر کرد، سەکردەکەیان ناوی (غازان) خان بوو، ئیبن تەیمیە لەگەڵ ژمارەیەك زانای تر چوون بۆ

لای، ئیبن تەیمیە هێندە بەرەقی قسەی لەگەڵ کرد کەهەموو زاناکانی تر ترسان، ئەو داوای کرد هەموو بەندکراوانی موسوڵمانان و بەندکراوە ناموسوڵمانەکانیش ئازاد بکرێن، ئەویش رازی بوو، پاشان هەموویانی ئازاد کرد، کاتێك گەڕانەوە زاناکانی تر وتیان لەگەڵ ئەو ناچینەوە تووشی شتێکمان دەکات، کەچی ویستی خوا وابوو ئیبن تیمیە بەسەلامەت گەیشتەوە، کەچی ئەوان تووشی دەستەیەکی مەغۆلە رێگرەکان بوون کە چییان پێبوو لێیان سەندن و ئازاری زۆریشیان دان.

کاتێك جارێکی تر مەغۆلەکان هاتن تا خاکی شام داگیر بکەن ئیبن تەیمیە هانی موسوڵمانانییدا تا رێیان پێنەدەن و وتاری بۆ دەدان، خۆیشی چوو بۆ لای سەرکردەی موسوڵمانان لەمیصر تا رازی بکات بێت بۆ هاوکارییان، ئەوەبوو بەسوپایەکەوە هاودەم بەسوڵتان گەڕایەوەو لەجەنگەکەدا خۆیشی بەشداری کردو خوای گەورەش سەرکەوتنی بەخشی بەموسوڵمانان، لەجەنگەکەشدا ئیبن تەیمیە بەردەوام موسوڵمانانی هاندەدا تا نەترسن و لەرێی خوادا بەگەرمی بجەنگن چونکە خوا موسوڵمانان سەردەخات.

هەمیشە هەندێك کەس هەن کە حەز ناکەن کەس لەوان گەورەتر بێت و خۆیان بەگەورە دەزانن، بۆیە ژمارەیەك لەو جۆرە کەسانە کەوتنە پیلان گێڕان دژ بەئیبن تەیمییەو لای دەسەڵاتداران تۆمەتیان بۆ دروست دەکرد تا ئەوەی بوونە هۆکاری بەندکردنی ئیبن تەیمیە، سێ جار لەدادگای دیمەشق دادگایی کرا، بەڵام لەهیچ کامیاندا نەیانتوانی بیسەلمێنن کە تاوانبارە و کاتێك زانییان بێتاوانە ئیبن تەیمیەیان ئازاد کرد.

بەڵام جارێکی تر کەسانێکی ناو میصر کە رقیان لەناوبانگی ئیبن تەیمیە بوو، تۆمەتیان بۆ دروست کردو داوایان کرد لەمیصر دادگایی بکرێت، خەلیفەش ئەوکات لە میصر بوو، ئەوان سەرکردەی وڵاتیان رازی کرد تا داوا لەدەسەڵاتداری شام بکات ئیبن تەیمیە بنێرێت بۆ میصر، هەرچەند ئەو رازی نەبوو بەڵام ئیبن تەیمیە خۆی بڕیاریدا بچێت و لەوێیش وەڵامی گومانەکان بداتەوە.

ئیبن تەیمیە بەڕێکەوت بەرەو میصرو لە کۆتاییەکانی مانگی رەمەزاندا گەیشتە شاری قاهیرە، کاتێك گەیشت رۆژی هەینی بوو، لەدوای نوێژی هەینی لەگەڵ زاناو کەسە دیارەکان مشتومڕی ئەنجامدا، بەڵام دواجار لەوێش بەندکراو دواتر گوازرایەوە بۆ بەندیخانەیەك کە پێی دەوترا (جب)، بەڵکو دوو برایشی لەگەڵ خۆیدا بەند کران.

هێندە دژایەتی ئەو زانایە کرا کە تەنانەت ئەوانەش شوێن نووسینەکانی بکەوتنایە ئەو کەسانەش بەند دەکران[1].

---

١_
https://zaniary.com/blog/5d6ec8f9b536d/%D8%AF%DB%95%D8%B1%D8%A8%D8%A7%D8%B1%DB%95%DB%8C-%D8%A6%DB%8C%D8%A8%D9%86-%D8%AA%DB%95%DB%8C%D9%85%DB%8C%DB%95

بۆچی دەسەڵاتداران وایان دەکرد لە کاتێکدا موسوڵمانیش بوون؟

لەبەرئەوەی هەندێك كەس كەحەزیان نەدەكرد ئیبن تەیمیە وەك زانایەکی گەورە دەربکەوێت وایان وتبوو بەدەسەڵاتداران کە ئیبن تەیمیە خەڵکی گومڕا دەکات، بەڵام ئیبن تەیمیە رێی نەدەدا کەس لەدژی دەسەڵاتدارانی موسوڵمانان هیچ بکەن چونکە نەبوونی ئاژاوەو پاراستنی یەکڕیزی و ئاشتی ناو موسوڵمانانی لەلا گرنگتر بوو تا ئازادبوونی خۆی.

ئیبن تەیمیە پاش ماوەیەك ئازاد کراو ئەو ماوەیەی ئازاد کرا لەمزگەوتەکاندا وانەی دەوتەوەو خەڵکی فێری زانست دەکرد، هاوکات نامەی دەنارد بۆ دایکی خۆشەویستی و بۆ خەڵکی دیمەشق و خۆشەویستی خۆی بۆیان دەردەبڕی.

هێندەی نەبرد جارێکی تر ئیبن تەیمیە بەند کرا، ئەمجارەش یەکێك لەبراکانی لەگەڵیدا بەندکرا، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە سوڵتانی موسوڵمانان خۆی هات بۆ بەندیخانە بۆ لای ئیبن تەیمیەو ئازادی کرد.

## ئەو سوڵتانە کێ بوو کە ئیبن تەیمیەی ئازاد کرد؟

ئەوسوڵتانە ناوی سوڵتان ناصر بوو کە کاتێك توانی بێتە سەر دەسەڵات خێرا ئیبن تەیمیەی ئازاد کرد.پاش حەوت ساڵ مانەوە لەمیصر دواجار ئیبن تەیمیە لەگەڵ سوڵتانی موسوڵمانانداندا گەڕایەوە بۆ شام، لەوێ پێشوازیەکی گەرمی لێکراو خێرا ئەویش دەستی کردەوە بەوانە وتنەوە.

بەڵام هێندەی نەبرد جارێکی تر ئەو زانایە کەوتە بەر پیلانی ناحەزان و سەرلەنوێ تۆمەتیان بۆ دروست کرد و ئیبن تەیمیەی زانای بێتاوان جارێکی تر بەند کرا، ئیتر لەو بەندیخانەیەدا مایەوە تا ئەوەی دواجار لەوێ نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد.

لە ماوەی ئەو بەند بوونەیدا ئیبن تەیمیە هەشتاو یەك جار هەموو قورئانی پیرۆزی خوێندەوەو زیکرو پەرستشی زۆری دەکرد.

کاتێك کۆچی دوایی کرد هەمووان بەمردنی دڵتەنگ بوون تەنانەت ئەوانەش کە دژی بوون، شار تەواو قەرەباڵغی دایگرت و هەموان هاتن بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمەکەی و مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی، هێندە قەرەبالغ بوو کە بازاڕی شار داخرا، نزیکەی پێنج سەد هەزار کەس نوێژیان لەسەر تەرمی ئیبن تەیمیە کرد.

پاش خۆی ئیبن تەیمیە نووسین و کتێبی زۆری جێهێشت بۆ موسوڵمانان، کتێبەکانی تا ئەمڕۆش موسوڵمانان دەیانخوێننەوەو سوود لە زانستەکەی وەردەگرن.

# ئیبن تەیمییە و زانکۆکانی ئەوروپا

وە هەروەها لەم ساڵانەی کۆتایشدا، زۆرێک لە زانکۆکانی ئەوروپا کەوتنە لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمەکانی ئەم کەڵە زانا کوردە. لەوانە:

زانکۆی(ئۆکسفۆرد)

زانکۆی(نوتینگهام)

زانکۆی(جۆرج تاون)

زانکۆی(ئەندیانا )

زانکۆی(کورنیل)

زانکۆی(ئەستنافورد)

بە دەیان کۆڕ و سیمینار دەربارەی ئەم پیاوە مەزنە کرا، چەندین بڵاو کراوە و چەند کتێبێکی لەسەر نوسرا، زۆرجار ناویان دەبرد بە(ئەو پیاوە مەزنەی کە ئوممەتەکەی لێی بێ ئاگان!).

(د. هنری لاوست) کتێبێکی لەسەر بڵاوکردەوە بەناوی(نظريات إبن تيمية في الاجتماع والسياسة) کە تیایدا دەڵێت: ئەم پیاوە بەجۆرێک مەزن بوو، کە نەک تەنها ئوممەتی ئیسلامی، بەڵکو تەواوی بەشەرییەتی قەرزداری خۆی کردووە، دەشڵێت: ئیبن تەیمییە لەکتێبی (السياسة الشرعية)دا، دەستورێکی تەواوی بۆ

حوکمڕانییەکی دروست نوسیوە، کە لەسەردەمی (قلاون)دا ئەم کتێبە وەک دەستوری هەموو پادشاکانی ئەوسەردەمە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، بەجۆرێک کە بەحەرفێک لێیان لانەدەدا.

د.کوج جلن دەڵێت: ئیبن تەیمییە ئەوکەسەیە، کە پێش هەموو کەسێ نەقدی مەنتقی ئەرستۆی کرد، کە دواتر ئەو مەنتقە زیانی زۆری بە ئەوروپا گەیاند و هەموو بۆچوونەکانی ئیبن تەیمییە لەسەری ڕاست دەرچوو.

## قوتابییەکانی ئیبن تەیمییە

هەروەک ئیبن حەجەر دەفەرمووێت: بەس بێت بۆ ئیبن تەیمییە کە قوتابییەکی وەکو (ئیبنولقەییم)ی پێگەیاندووە.

مامۆستا کرێکاریش دەفەرمووێت: ئیبنولقەییم یەکێکە لە چوار قوتابیی ئیبن تەیمییە؛ کە زانستی ئەویان لەگەڵ زوهد و خواناسییەکەیدا هەڵگرتووە، ئەوانی تر(ئیمامی زەهەبی و ئیبن کەسیر و خاتوو بنتوعەییاش) بوون.

## هەندێک لە قوتابییەکانی:

- زەهەبی(محمد بن احمد بن عثمان الذهبي الشافعي)
- ئیبنولقەییمی جەوزی(محمد بن أبی بکر بن أيوب الحنبلي)
- ئیبن عەبدولهادی(محمد بن أحمد بن عبدالهادي)
- ئیبن موفلیح(محمد بن مفلح بن محمد المقدسي الحنبلي)
- ئیبن کەسیر(إسماعيل بن عمر بن كثير الشافعي)
- بەرزالی(علم الدين القاسم بن محمد البرزالي)
- واستی(أحمد بن إبراهيم بن عبدالرحمن الواسطي) ئیبن تەیمییە ناوی نابوو(جونەیدی سەردەم).

چەندان قوتابی تریش، وەک: ئیبن سەیدولناس و میززی و بەزاڕ و ئیبنولوەردی[1].....

---

[1] سایتی(زادی ڕێمان)
https://new.zadyreman.com/detailnews.aspx?jimare=1522&babet=52

## کۆتا دادگایی و زیندانی کردنی؛ تا کۆچی دوایی:

ئیبن تەیمیە لەماوەی تەمەن و ژیانیدا بۆماوەی ۱۷ ساڵ لە زیندان ماوەتەوە بەڵام بەشێوەی پچڕ پچڕ، واتا ئەو ۱۷ ساڵە لەسەر یەک حوکم نەدراوە، هەروەها چەندین جاریش دادگایی کراوە بەڵام ئێمە لێرەدا کۆتا دادگایی و لێپێچینەوەی باس دەکەین.

کۆتا دادگایی و لێپێچینەوەی ئەوەبوو؛ لەسەر فەتوایەکی ساڵی ۷۰۹ک دابووی دەربارەی چوونە سەر گۆڕی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و پیاوچاکان، کە بەو شێوەیە هاتووە، دەڵێ: (دروست نییە مەبەستی سەرەکیت لە سەردانیکردنت بۆ مەدینە، گۆڕی پێغەمبەر بێت درودی خوای لەسەر، مەگەر بۆ کارێک بچی لەوێ سەردانی بکەی، ئەوە شتێکی ئاساییە و دروستە). ئیتر بەوە کەوتنەوە دژایەتی و هانابردن بۆ لای سوڵتان، تا بەتەواوی داییڕن لە فەتوادان و پێگەیاندنی فێرخوازان و تێگەیاندنی خەڵکی، چونکە کاریگەریەکی ئێجگار زۆری هەبوو لەسەر فێرخوازان و خەڵکی ناوچەکە، لە ساڵی ۷۲٦ک، ئیبن جوملە دەقی فەتواکەی گۆڕی و بەرزی کردەوە بۆ لای سوڵتان، دیسانەوە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێک دادوەر و قازی دەوڵەت، بڕیاردرا بە زیندانیکردنی لە زیندانی قەڵا(قلعة) لە دیمەشق، براکەشیان لەگەڵدا نارد -کە ناوی شەرەفەددین بوو- تا لەوێ خزمەتی بکات، بەڵام زۆری نەخایاند لە ساڵی ۷۲۷ک براکەی کۆچی دوایی کرد، ئیبن تەیمییە خۆی نوێژی لەسەرکرد، دوای مردنی براکەی بڕیاریاندا ڕێگربن لە نوسینەکانی، بەوەی کاغەز و قەڵەمی لێ دوور بخەنەوە. ئەویش لەوێ کاتەکانی

خۆی هەر بە نوسینەوە و خواپەرستی و قورئان خوێندن بەسەردەبرد، هێندەی نەبرد لە ساڵی ٧٢٨ک (١٣٢٨ز)توشی نەخۆشی بوو، دوای بیست ڕۆژ بەو نەخۆشییە سەری نایەوە و کۆچی یەکجارەکی کرد، لە گۆڕستانی(الصفية)یاخود (الصوفية)لە دیمەشق لە تەنیشت براکەی (شەرەفەدین) بە خاک سپێردرا.

# ئیبن سەڵاحی شارەزووری

ئیبن سەڵاحی شارەزووری (بە عەرەبی: إبن الصلاح الشهرزوري) زانای موسوڵمانی پەیڕەوی ڕێبازی سوننە، فەرموودەناس، مامۆستا، فەقیهـ، موفەسیر و خاوەنی زانستەکانی فەرموودە (صاحب علوم الحديث)، کە لە سەردەمی خیلافەتی عەباسیدا ژیاوە، ناوی تەواوی عوسمانی کوڕی موفتی کوڕی سەڵاحەدین عەبدولرەحمانی کوڕی موسای کوردیی شارەزوورییە، ناسراوە بە ئیبن سەڵاح، لە ساڵی ١١٨١ لە گوندی شەرخان لە شارەزوور لەدایکبووە، یەکێکە لە زانایانی بواری فەرموودە، سەرەتا لەلای باوکی لە شارەزوور دەستی بە خوێندن کردووە، باوکیشی یەکێک بووە لە زانایانی ناوچەکە کە لە نێوان ساڵەکانی ١١٤٤ بۆ ١٢٢١ ژیاوە، دواتر لەگەڵ باوکیدا چووە بۆ مووسڵ ماوەیەکی کەم لەوێ ماوەتەوە، پاشان بە وڵاتە ئیسلامیەکاندا گەڕاوە بۆ بەدەستهێنانی زانست، لەوانەش: مووسڵ، بەغداد، خۆراسان، هەمەدان، نیساپور، حەڕان و دیمەشق.

## ئەو مامۆستایانەی کە ئیبن سەڵاح لەلایان خوێندویەتی:

لە موسڵ لەلای (عەبدوڵای کوڕی سەمین، مەحموودی کوڕی عەلی مووسڵی و باوکی موزەفەری کوڕی بەرنی) خوێندوویەتی، پاشان ڕۆشتووە بۆ بەغداد و لەلای (باوکی ئەحمەدی کوڕی سەکینە و عومەری کوڕی تەبەرزەد) خوێندوویەتی، دواتر لە هەمەدان لەلای

(باوکی فەزڵی کوڕی مەعزەم) خوێندوویەتی، هەروەها لە نیساپور لەلای (موئەیەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی عەلی توسی، زەینەبی کچی ئتبوقاسمی شەعری و باوکی مەعالی کوڕی ناسر ئەنساری) خوێندوویەتی، پاشان گەشتی کردووە بۆ شام لەلای (باوکی موزەفەری سەمعانی لە مەڕو، باوکی موحەمەدی کوڕی ئوستاز لە حەلەب) خوێندوویەتی، لە دیمەشق لەلای (ئیبن عەساکیر و ئیبن قودامە) وانەی خوێندووە، لە حەڕان لەلای (حافز عەبدول قادری روهاوی) خوێندوویەتی، پاشان لە قوتابخانەی سەلاحییە لە مزگەوتی ئەقسای پیرۆز لە قودس خوێندوییەتی، بەڵام کە فەرمان درا بە ڕووخانی دیواری شارەکە، کۆچی کردووە بۆ دیمەشق ماوەیەک لە ڕەواحیە خوێندوویەتی، کاتێک ماڵی ئەشرەفییە (الدار الأشرفية) کرایەوە بووە بە شێخی ئەو شوێنە، پاشان بووە بەرپرسی وتنەوەی وانەی "الشاميلة صغرى".

## قۆناغی تەدریس و وانەگوتنەوەی:

لە دوای گەشتە دوور و درێژەی؛ کە ئیبن سەلاح بە مەستی وەرگرتنی زانست و کۆکردنەوەی فەرموودە گرتبوویەبەر، لێی بەردەوام بوو، تاوەکو لە شاری قودس جێگیر بوو، هەر لەوێش دەستی کرد بە وانەگوتنەوە و پێگەیاندنی فێرخوازان لە خوێندنگەی سەڵاحییە(کە سەلاحەدینی ئەیوبی بونیادی نا، بۆیە هەر بەو ناوە ناونراوە). کە سەرەتا چووە شارەکە خەڵکێکی زۆر لە پێشوازی دابوون، چونکە ناوبانگێکی تەواوی دەرکردبوو بە بلیمەتی و پڕعیلمی و تەقواکەی، لە دوای بەسەربردنی ماوەیەکی درێژ لە

وانەگوتنەوە لە قودس، ئینجا چووە دیمەشق، لەوێش لە خوێندنگەی(الرواحية) وانەی گوتەوە تا قوتابی و فێرخوازانی زیاتر پێبگەیەنێ. دوای ئەوەی مەلیک ئەشرەفی کوڕی عادل(خانەی فەرموودەی) دامەزراند(وەک خوێندنگەیەکی تایبەت بە فەرموودەوانی)، زۆر پێداگری کرد کە ئیبن سەڵاح وەک سەرۆکی مەدرەسەکە دابمەزرێنێ، ئیبن سەڵاح بەو مەرجە ڕازی بوو کە دەبێ ڕێگەی بدەن تا لەهەمانکاتدا بتوانێ لە خوێندنگەی(ست الشام)یش وانەبێژی بکات(کە خاتوو زمردی ئەیووبی -خێزانی ناسرەدین ئەسەدەدین شێرکۆی والی حمس- دایمەزراندبوو) کە تایبەت بوو بە فێرخوازانی ئافرەت.

## کارەکانی لە وڵاتی شام:

- وانەوتنەوە لە قوتابخانەی ناسریە لە قودسی پیرۆز.
- وانەوتنەوە لە قوتابخانەی ڕەواحیە.
- وانەوتنەوە لە قوتابخانەی خاتونی شام(ست شام).
- ماوەی ١٣ ساڵ شێخی ماڵی فەرموودەی ئەشرەفیە بووە.

## ئەو خوێندکارانەی کە لەلای ئیبن سەڵاح خوێندویانە:-

فەرموودەی لێ وەرگیراوە لەلایەن: ئیمام شەمسەدینی کوڕی نوحی مەقدیسی، شەمسەدینی کوڕی خەلەکانی ئەربیلی و ئیمام کەمالەدین ئیسحاق و چەندانی تر.

ڕیوایەتی لێ وەرگیراوە لەلایەن:

- ئیمام شەریفەدینی نەوەوی.
- قازی شەهابەدینی کوڕی خوەیی.
- فەرمووودەناس عەبدووڵڵای کوڕی یەحیای جەزائیری.
- موفتی فەخرەدین عەبدول ڕەحمانی کوڕی یوسف بەعلبەکی.
- شێخ ئەحمەدی کوڕی عەبدول ڕەحمان شارەزووری.
- عیمادی کوڕی بالیسی و چەندانی تر.

---

https://zaniary.com/blog/6250b39adec38/%D8%A6%DB%8C%D8%A8%D9%86-%D8%B3%DB%95%DA%B5%D8%A7%D8%AD-%D8%B4%D8%A7%D8%B1%DB%95%D8%B2%D9%88%D9%88%D8%B1%DB%8C

## لە گرنگترین نووسراوەکانی:

ئەم زانا بەڕێزە خاوەنی چەندین کتێبی زانستیە لە بوارە جۆراوجۆرەکان، دیارترین و بەناوبانگترینیان بریتییە لە کتێبی (مقدمة ابن الصلاح) لەزانستی فەرموودەناسی کە تا ئێستاش لەجیهانی ئیسلامی لە زانکۆ و پەیمانگاو حوجرەو قوتابخانەکان و تەنانەت لەخوێندنی باڵاش ئەم کتێبە دەخوێنرێت، وە وتراوە هەر زانایەک لە پاش (ئیبن سەڵاحی شارەزووری) کتێبی لە بوارەی فەرموودەناسی (علم الحديث) نووسیبێت سەرچاوەی سەرەکی بریتی بووە لە کتێبەکەی پێشەوا ( ئیبن سەڵاحی شارەزووری)، هەروەها ئەم کتێبە جگە لە بابەتی زانستی زۆر ورد لەخۆ دەگرێت کە بریتییە لە (علم تحقيق النصوص وتوفيق المروريات) چۆنیەتی تخقیق کردنی دەق و بەهێزکردن و متمانەدان بە گێڕاوەکان[1]. هەروەکو ئاماژەمان پێدا پەرتوکی زانستەکانی فەرموودە یان پێشەکی ئیبن سەڵاح بە باشترین پەرتوک دادەنرێت لە بواری فەرموودەدا، کە کردنەوەی دەرگایەکی نوێ بوو بۆ نووسین لە بواری زانستەکانی فەرموودەدا، بەهۆی گرنگی ئەم پەرتوکەوە بووە بە سەرچاوەیەک بۆ نووسین، لە دوای خۆی لە لایەن زانایانەوە چەندین جار شیکردنەوەی بۆ کراوە و پوختکراوەتەوە، لە گرنگترین نوسراووەکان:

– 1- الإرشاد للإمام النووي ( تلخيص لكتاب علوم الحديث).
– 2- اختصار علوم الحديث ابن كثير الدمشقي.
– 3- الخلاصة في علم الحديث للشي.

---

١ _ ٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی،ن:سەربەست جەباری ، ل:٢٧٠–٢٧١

## لە گرنگترینی کتێبەکانی ئەمانەن:-

- علوم الحديث أو معرفة أنواع علم الحديث المعروف بمقدمة ابن الصلاح.
- طبقات فقهاء الشافعية اختصره الإمام النووي.
- فوائد الرحلة وهو في أجزاء كثيرة عن رحلته إلى خراسان.
- أدب المفتي والمستفتي.
- نكت المهذب.
- الأمالي.
- صلة الناسك في صفة المناسك.
- الفتاوى طبع في مجلد.
- شیکردنەوەی پەرتوکی ( الوسيط في فقه الشافعية).
- شیکردنەوەی پەرتوکی( صحيح مسلم).
- المؤتلف والمختلف في أسماء الرجال.
- أحاديث في فضل الإسكندرية وعسقلان.

ئیبن سەلاحی شارەزووری چەند دەستنووسێکی هەن کە تا ئێستا لێکۆڵینەوە و تەحقیق نەکراون، کە لەکتێبخانەکانی ئەیاسۆفیا لەئەستەنبوڵ و کتێبخانەی ڕیاز لەوڵاتی سعودییە پارێزراون. ئەمە جگە لەچەند دەستنووسێکی دیکە کە مێژوونووسان بە نووسراوی ئیبن سەلاحیان داناوە بەڵام پێویستییان بە لێکۆڵینەوە و پشتڕاستکردنەوە هەیە، کە ئەوانیش لەکتێبخانەی ڕاغب پاشا لە ئەستەنبوڵ و کتێبخانەی ڤاتیکان لەوڵاتی ڤاتیکان پارێزراون1.

---

١_ https://www.kurdipedia.org/default.aspx?lng=1&q=20210610222449394504

## کۆچی دوایی:

شێخی ئیسلام لە بەیانی ڕۆژی چوارشەمەی ١٩ی ئەیلوولی ساڵی
(١٢٤٥ز/٦٤٣ك) لە دیمەشق کۆچی دوای کردووە، بە ئامادەبونی ژمارەیەکی زۆر لە نوێژخوێن لە گۆڕستانی سۆفییەکان لە دیمەشق نێژراوە، ئیبن سەڵاح چەندین نووسینی بەنرخی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە کە بەڵگەیە لەسەر زۆری زانست و زانیاری ئەو، هەندێک لە نووسینەکانی پێداچونەوەی نووسراوەکانی گەورە زانایانە.

## بۆچونی زانایان دەربارەی ئیبن سەڵاح:

شەمسەدین ئیبن خەلەکان دەربارەرەی مامۆستاکەی (ئیبن سەڵاح) وتویەتی: ئیبن سەڵاح هەر لە تەمەنی گەنجیدا بووە بە یاریدەدەر لەلای عیمادەدینی کوڕی یونس، یەکێک بووە لە زانایانی سەردەمی خۆی لە بواری تەفسیر و فەرموودە و فیقهـ و هەرچی کە پەیوەستە بە زانستی فەرموودەوە، یەکێک بووە لەو شێخانەی کە سوودم لێ بینیون، ئیبن کەسیریش دەربارەی ئیبن سەڵاح وتویەتی: یەکەم شێخی وتنەوەی وانە بووە لە (دار الحديث) لە دیمەشق، عومەری کوڕی حاجب لە پەرتوکەکەیدا بەم شێوەیە باسی ئیبن سەڵاحی کردووە: "خاوەنی شکۆیەکی سەرسوڕهێنەر بووە، ئیمامێکی پاک، ئەقڵێکی فراوان، دەریایەک لە زانست، زمان پاراو، تێکۆشەر لە دینداریدا، زانستێکی بەسوود، دیندارێکی بەهێز بوو".

# ئیبن جەزەری

ئەم زانا کوردە بەڕێزە کە بە "شێخی قورئان" یش، ناسراوە..

ناوی تەواوی (محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی یوسف)ە، کە بە (ابن الجزری) ناسراوە، لەساڵی (٧٥١ک/ ١٣٥٠ز) لە جەزیرەی (ابن عمر)ی، نزیک شاری موسڵ لەدایک بووە و لەشاری (دیمەشق)یش، گەورە بووە و پێگەیشتووە[1].

دەگووترێ باوکی ئیبن جەزەری پێش لە دایک بوونی ئیبن جەزەری ساڵی ٧٥٠ی کۆچی حەجی کرد و ئاوی زەمزەمی خواردەوە بە نیەتی کوڕێکی زانا، داوای لە خودا کرد کە کوڕێکی پێ ببەخشێ و ئەو کوڕەش ببێتە زانا. لەتەمەنی ١٣ ساڵیدا قورئانی لەبەرکردووە و لەتەمەنی ١٤ ساڵیشدا بووەتە ئیمام[2].

هەروەها ئیبن جەزەری لەشاری دیمەشق قوتابخانەیەکەی دامەزراندووە بەناوی (دار القرآن)، لە ژیانیدا چەندین شار و وڵات گەڕاوە، ئەم زانا بەڕێزە خاوەنی چەندین کتێب و نووسراوی بەپێزە بەتایبەت لە بواری زانستەکانی قورئان و علمي قراءات، کتێبەکانی لەزۆرێک لە وڵاتان کراوە بە مەنهەجی خوێندن[3].

---

١_ ٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی، ل: ٢٧٢

٢_https://ckb.m.wikipedia.org/wiki/%D8%A6%DB%8C%D8%A8%D9_%86_%D8%AC%DB%95%D8%B2%DB%95%D8%B1%DB%8C

٣_ ٤٠وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی، ل:٢٧٢

ئەم زانا ئازیزە ئیمامی حافز و هەروەها کەسێکی شافعی مەزهەب بووە، لە گۆڕەپانی بەرهەم نووسیندا بەرهەمی زۆری هەبووە لە چەند بوارێکی ئیسلامی، یەکێک لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی پەرتووکی پێشەکیی جەزەری یان مەتنی جەزەری کە لە ١٠٩ بەیتە شیعر پێکهاتووە لە باسی زانستی تەجوید، تیایدا باسی دەرچەی پیتەکان و سیفاتی پیتەکان و ئەحکامەکانی تەجوید و هتد بە شیعر دەکات.

## ئەو پێشەکییەی کە پێویستە قورئانخوێن بیزانێ:

ئەو پێشەکییەی کە پێویستە قورئانخوێن بیزانێ ناسراو بە پێشەکیی جەزەری یان مەتنی جەزەری، مەتنی ئیمامی ئیبن جەزەریە سەبارەت بە زانستی تەجوید.

لەگەڵ بچووکی پەرتووکەکە، زۆربەی بابەتەکانی تەجوید لەخۆدەگرێت، بە گوێەکی (لەفزێکی) جوانیش، هەروەها توانی ڕازی بوونی خەڵکی وەدەست بهێنی هەر لە سەرەتای نووسینی تا ئێستاش، هەروەها زانایان لە چەند سەردەمی جیاواز شەرحیان بۆ داناوە، چەند شەرحێکیش لەو شەرحانە لە چاپ دراوە، لە ١٠٩ دێرە شیعر پێکهاتووە، بەڵام ئیبن جەزەری سەردێر و ناونیشانی لە نێوان دێرەکان دانەناوە، بەڵام ئەوانەی کە دوای ئەو لێیان کۆڵیەوە و لەبەریان گرتەوە، چەند ناونیشانێکیان بۆ داناون.



بسم الله الرحمن الرحيم

يقول راجي عفو رب سامع / محمد ابن الجزري الشافعي
الحمد لله وصلى الله / على نبيه ومصطفاه
محمد وآله وصحبه / ومقرئ القرآن مع محبه
وبعد إن هذه مقدمه / فيما على قارئه أن يعلمه
إذ واجب عليهم محتم / قبل الشروع أولا أن يعلموا
مخارج الحروف والصفات / ليلفظوا بأفصح اللغات
محرري التجويد والمواقف / وما الذي رسم في المصاحف
من كل مقطوع وموصول بها / وتاء انثى لم تكن تكتب بها
مخارج الحروف سبعة عشر / على الذي يختاره من اختبر
فألف الجوف وأختاها وهي / حروف مد للهواء تنتهي
ثم لأقصى الحلق همز هاء / ثم لوسطه فعين حاء

أدناه غين خاؤها والقاف / أقصى اللسان فوق ثم الكاف
أسفل والوسط فجيم الشين يا / والضاد من حافته إذ وليا
الاضراس من أيسر أو يمناها / واللام أدناها لمنتهاها
والنون من طرفه تحت اجعلوا / والرا يدانيه لظهر أدخل
والطاء والدال وتا منه ومن / عليا الثنايا والصفير مستكن
منه ومن فوق الثنايا السفلى / والظاء والذال وثا للعليا
من طرفيهما ومن بطن الشفه / فالفا مع اطراف الثنايا المشرفه
للشفتين الواو باء ميم / وغنة مخرجها الخيشوم
صفاتها جهر ورخو مستفل / منفتح مصمتة والضد قل
مهموسها فحثه شخص سكت / شديدها لفظ أجد قط بكت
وبين رخو والشديد لن عمر / وسبع علو خص ضغط قظ حصر
صفيرها صاد وزاي سين / قلقلة قطب جد واللين
واو ويا سكنا وانفتحا / قبلهما والانحراف صححا

"کۆپییەکی نووسراوی پێشەکیی جەزەری"

## چەند نمونەیەک لە بەرهەمەکانی:

بەرهەمی زۆرن، بە تایبەت لە زانستەکانی قورئان، ئەمانەش چەند نمونەیەکن:-

- (تحبير التيسير فى القراءات العشر)، لە چاپ دراوە.
- (البيان فى خط عثمان)
- (نحفة الإخوان فى الخلف بين الشاطبية والعنوان)
- (البداية فى علوم الرواية)
- (مقدمة علوم الحديث)
- (الإجلاء والتعظيم فى مقام إبراهيم)
- (الإصابة فى لوزام الكتابة)

## کۆچی دوای ئیبن جەزەری

ئیبن جەزەری لەکۆتایی تەمەنیدا لەشاری شیرازی ئێران نیشتەجێ بووەو بووە بە دادوەر (قاضي) ئەو شارە و هەر لەوێشدا لەساڵی (٨٣٢ک/ ١٤٢٩ز) کۆچی دوایی کردووە.

---

ویکیپیدیای کوردی و ویکیپیدیای عەرەبی.

٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی، ن: سەربەست جەباری.

# کۆتایی

لە کۆتایدا ئەڵێم سوپاس و ستایش بۆخوای باڵادەست کە تەمەن و مەودای پێمدا تاوەکو ئەم کتێبە بنووسم و تەواوی بکەم، بێگومان ئەم کتێبەش هەروەکو مرۆڤ لەهەڵە بەدەر نابێت جا لەڕووی هەر لایەن و بوارێکدا بێت، چونکە ئەم کتێبە قسەی بەندە و مەخلوقی خودایە..

بۆیە لە هەر هەڵەو کەم و کووڕیەکی نێو ئەم کتێبە بمان بوورن.

هیوادارم توانیبێتم حەق و مافی تەواوەتی و ناساندنم بۆ بەشێک لەو کەسایەتیانە کردبێت کە لە کتێبەکەمدا ناوم هێناون، بێگومان میللەتی کورد لە زۆر بواری جیاوازدا کەسایەتی و مێژوونووس و زانا و دانا و گەریدەی زۆر هەیە، بەڵام من لەم کتێبەدا تەنها بەشێکیانم بۆتان خستووەتە ڕوو، کە حەزم کردووە زیاتر بایناسن و شارەزای ژیان و کارەکانیان بن...

محمد سعيد محمد

کەرکوک_کوردستانی عێراق

۲۰۲۳/۷/۲۹ ڕۆژی شەممە.

## سەرچاوەکان:

١_ کتێبی ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستیەکاندا، ن: د.کاوە فەرەج، پزیشکی شارەزای نەخۆشییەکانی سنگ.

٢_ کتێبی ئەزموونێک لە گۆڕانکاری مێژووی گەلان، ن: ماکوان کەریم.

٣_ کتێبی ٤٠ وانە لە شارستانیەتی ئیسلامی، ن: مامۆستا سەربەست جەباری.

٤_ کتێبی (١٠٠١ داهێنان لە کەلەپووری زانایانی موسوڵمان) بەڕێوەبەری نووسین: پرۆفیسۆر سەلیم حەسەنی، وەرگێڕانی: جوتیار قارەمان.

٥_ کتێبی((الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل)).

٦_ کتێبی صلاحەدینی ئەیوبی، ن: د.علی صەلابی،وەرگێڕانی:جەمیل قادر.

٧_ كتاب الروضتين (٢٥٢/٢).

٨_ تاريخ بيت المقدس، د.محمد الحافظ التقرل، ل:١٣٣.

٩___ القائد صلاح الدين وتحرير بيت المقدس أضحى صلاح الدين القائد المنتصر في هذه المعركة على الصَّليبيين الذين سادوا العالم الإسلامي بأسره.

١٠_س وج.. كل ما تريد معرفته عن معركة حطين فى ذكرى وقوعها؟ - اليوم السابع تمر اليوم الذكرى الـ832، على انتصار المسلمين بقيادة صلاح الدين الأيوبي على صلابي.

١١_صلاح الدين الأيوبي ومعركة حطين الفاصلة التحق صلاح الدين بخدمة عمه أسد الدين شيركوه، وكان أسد الدين مرافقاً لنور الدين؛ الذي تولَّى قيادة الزنكيين بعد مقتل والده، ويبدو أنَّ نور الدين أدرك قدرات صلاح الدين العسكرية.

١٢_معركة حطين معركة حطين معركة فاصلة بين الصليبيين والمسلمين بقيادة صلاح الدين الأيوبي، وقعت في يوم السبت 25.

١٣_ معركة حطين و فتح بيت المقدس صلاح الدين الأيوبي حرر بيت المقدس من الصليبين دعمك لنا بالانتساب في القناة يساعدنا علي الاستمرار والأبداع.

١٤_النوادر السلطانيه، ل:٤١٩.

١٥_ دكتۆر (زيگريد هۆكه) ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی لەکتێبەکەی بەناوی (شمس العرب تسطع الغرب) لەلاپەڕەی ٤٨٨ باس لە کوردبوونی زریاب دەکات.

١٦_ کتێبی (وەستا ڕەجەب چەکسازی بلیمەتی) نوسینی:جەواد ساڵح نەورۆز.

١٧_بەرنامەی دۆکۆمێنتاری لەسەر ژیاننامەی ئیبن مستەوفی.

١٨_کتێبی:وتە و ئامۆژگاری و ژیاننامەی ئیبن تەیمییە،

ن:سيد عبدالله، وەرگێرانی بۆسەر زمانی کوردی:محمد محمد حەمە میرزا.

١٩_ ویکیپیدیای کوردی.

٢٠_ ویکیپیدیای عەرەبی.

٢١_ سایتی(زادی ڕێمان).

٢٢_سایتی مێژووی کورد// www.historyofkurd.com

http://www.pacal.de/pirireis_en.htm

http://thebiggestsecretsoftheworld.blogspot.com/2011/02/piri-reis-map-of-1513-out-of-place.htm

https://www.youtube.com/watch?v=l4nCZjFjxTI

https://ckb.m.wikipedia.org/wiki/%D9%BE%DB%8C%D8%B1%DB%8C_%DA%95%D8%A6%DB%8C%D8%B3

-http://alsiraat.co.uk/books/e-book-salah-ad-deen-al-ayubi

https://zaniary.com/blog/63ee848d81f27/%D8%AC%DB%95%D9%86%DA%AF%DB%8C-%D8%AD%DB%95%D8%AA%DB%8C%D9%86

https://nektar.co.at/arab/?p=329

https://kurdipedia.org/default.aspx?lng=1&q=201205222241456484 7

https://zaniary.com/blog/62acfbd1e85e3/%D8%AA%DB%86%D9%BE%DB%95%DA%A9%DB%95%DB%8C-%D9%88%DB%95%D8%B3%D8%AA%D8%A7-%DA%95%DB%95%D8%AC%DB%95%D8%A8

https://new.zadyreman.com/detailnews.aspx?jimare=1527&babet=5 2

https://xalkurd.org/details.aspx?kodtech=291

https://www.dabran.org/Dreje.aspx?jimare=2554&paiwandidar=2

https://zaniary.com/blog/5d6ec8f9b536d/%D8%AF%DB%95%D8%B1%D8%A8%D8%A7%D8%B1%DB%95%DB%8C-%D8%A6%DB%8C%D8%A8%D9%86-%D8%AA%DB%95%DB%8C%D9%85%DB%8C%DB%95

https://www.kurdipedia.org/default.aspx?lng=1&q=2021061022244939 4504

# ناوەڕۆک

# لە کتێبەکەوە:

هەرکاتێک لایەنی خوێندن و خوێندەواری و زانست و زانیاری فەرامۆش کرا چ لەلایەن دەسەڵاتدارانی موسڵمانان یاخود لەلای تاک بەتاکی موسڵمانانەوە بێت، ئەوا شارستانیەتی ئیسلامی بەرو لاوازی هەنگاو دەنێت هەروەکو ئێستا لەبەرچاومانە کە لەم ڕۆژگارەدا بەچاوی سەر دەیبینین بەداخەوە کە جیاوازیەکی زۆرمان هەیە لەگەڵ ڕابردوومان‌دا لەبواری زانست و داهێنان و شارستانیەتدا.

محمد سعيد محمد